

د. ئاوڕەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگی میدیا

## کوردی-کوردی

- ئـ -

بەشی یەکەم

(ئـ ، ئا ، ئاب ، ئاپ ، ئات ، ئاج ،

ئاچ ، ئاخ ، ئاد ، ئار ، ئاز ، ئاژ )

هەولێر ٢٠١١

د.ئاوڕەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگی میدیا

## کوردی-کوردی

- ئـ -

بەشی یەکەم

(ئـ ، ئا ، ئاب ، ئاپ ، ئات ، ئاج ،

ئاچ ، ئاخ ، ئاد ، ئار ، ئاز ، ئاژ )

هەولێر ٢٠١١

## وتەیەکی پێویست

دوای ئەوەی کە لیژنەی چاپکردنی کتێب زانیاری پێگەیشت کە دکتۆر ئاورەحمان حاجی مارف بەر لە کۆچکردنی دوایی ماوەیەکی دوورودرێژە خەریکی دانانی فەهەنگێکی (کوردی کوردی)یە، بە پێویستی زانی کە دکتۆر ئازاد ئەحمەد رابسپێری کە سۆراغی ئەو فەرهەنگە بکات، ئەویش لەلای خۆیەوە دوای گەڕان و بە دواداچوون بۆی دەرکەوت کەلەلای (دکتۆر محەمەد زەهاوی)یە و پارێزراوە، لێی وەرگرت و بەدەستپاکییەوە، خستییە بەردەم لیژنەی فەرهەنگ لە ئەکادیمیای کوردی، دوای ئەوەی کە فەرهەنگەکەیان بینی و بە بابەتێکی زۆر پڕ بایەخ و زانستیان لە قەڵەمدا، بە تایبەتی پێشەکییەکەی کە لەزانستی دانانی فەرهەنگ دەدوێ، بۆیە لیژنەی چاپکردنی کتێب بە بێ دەستکاریکردنی پەسەندی کرد و بڕیاریدا کە چاپ بکرێ.

**لیژنەی چاپکردنی کتێب لە ئەکادیمیای کوردی**




* ناوی کتێب:فەرهەنگی میدیا
* نووسینی: د.ئاورەحمانی حاجی مارف
* سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: عوسمان پیرداود
* لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ( ١٠٦ )
* تیراژ : ٧٥٠ دانە
* ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٨٣ ) ساڵی (٢٠١١)ی پێی دراوە.
* چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر

# ڕازێك

لە ناوەڕاستی ساڵەکانی شەستدا ، کە خوێندکاری پۆلی سێیەمی کۆلێژی ئادابی لێنینگراد بووم ، بیر و هزری دانان و نووسینی فەرهەنگێکی ڕووسی ــ کوردی دەیورووژاندم . لەو ساڵەی خوێندنەوە ، کە دەبوو هەر خوێندکارێك بابەتێك هەڵبژێرێ و بیکاتە بوار و مەیدانی پسپۆڕیی خۆی ، منیش کەڵکم لەو هەل و دەرفەتە وەرگرت و بڕیارمدا بچمە کۆڕی فەرهەنگنووسییەوە . بێ هیچ دوودڵییەك دەڵێم : ئەوی پتر پاڵیپێوەنام لەو هەنگاوەدا و یاریدەی دام ، ئەوە بوو ، کە ڤلادیمیر ڤیتڤیتسکیی سەرپەرشتی ئەم کۆڕە هێندەی ئەرك دەدا بە شانی خوێندکاردا ، بەجێهێنانی هەر وا ئاسان نەبێ و ، چاویشی لە هیچ نەدەپۆشی ... ئەگەرچی گەلێ لە خوێندکارانی ڕووس ئامۆژگارییان کردم ، خۆم نەخەمە داوی ڤ . ڤیتڤیتسکییەوە و ئەوەیان هێنایەوە یادم ، کە چۆن پار ــ واتە لە پۆلی دووەمدا ــ کە ئەو دەرزی ( لێکسیکۆلۆژی )ی پێدەوتین . گەلێ جار لە تاقیکردنەوەیدا دەکەوتین و پاش ماوەیێك سەرلەنوێ تاقییدەکردینەوە و تا ئێستاش ژمارەیێکی زۆر لە بابەتەکەی ئەودا هەر ماونەتەوە ... هاوڕێکانم ڕاستیان دەکرد هەر لەبەر ئەو هۆیەش بوو ، هەر کۆڕەی چل پەنجا خوێندکاری تێدابوو ، بەڵام کۆڕی فەرهەنگنووسی ، بە

منەوە تەنها سێ کەس بووین ... ڕاستییەکەی من خۆم بۆ ماموستاییێکی وا دەگەڕام ...

لە یەکەم دانیشتن و چاوپێککەوتنندا کە باسی ئاوات و پرۆژەی خۆمم بۆ کرد ، بەدڵ گوێی بۆ شلکردم ، کە لێبوومەوە بە زەردەخەنەیەکەوە پێی وتم : (( زۆر چاکە هێندە پەرۆشی نووسینی فەرهەنگێکی ڕووسی - کوردیيت . بەڵام با ڕاست و ڕەوان پێت بڵێم ... ئەمساڵ لەسەر ڕای خۆت دەمێنی . ساڵی ئاینده دوودڵی ڕووت تێدەکا و لە پۆلی پێنجەمدا بەتەواوی وازی لێدێنی .... چونکە فەرهەنگدانان کارێکی ئاسان نییە ... )) ... ئەوجا ناوی هەندێ لێکۆڵینەوەی دامێ و وتی : (( ئەمڕۆ ئەو سەرچاوانە لە کتێبخانەی زانستگا وەربگرە ، بیانخوێنەوە و هەفتەکەی دی لێت دەپرسم ، بزانم چییان لێتێگەیشتووی )) ... سەرچاوەکانم وەرگرت . هێندە زۆر بوون بە نقەنق گەیاندمنە ماڵەوە . بێ وەستان کەوتمە خوێندنەوەی یەکەم وتار . بەڵام لەوە دەچوو بە ڕووسی نەبێ ، بە زمانێکی سلاڤیی دی بێ ... ئەو هەفتەیە بەردەوام دەمخوێندەوە ، بەڵام لەوەی پێی سپاردبووم ، تەنیا فریای چارەکێکی کەوتم و هەر لە چارەکێکی ئەو چارەکەش گەیشتبووم ... بەشەرمەوە چوومەوە کنی و ڕاستییەکەم پێوت . هەستم کرد نارازییە ... کەمێ بێدەنگ بوو ، ئەوجا وتی : (( با یەکەم جار وابێ ... جارێکی دی ئەمەم قوبووڵ نییە ... دەزانم تۆ هێشتا

ڕووسی باش نازانیت و زانستی فەرهەنگیش بۆ تۆ شتێکی نوێیە ، بەڵام دەبێ پتر خۆت ماندوو بکەی ... دوو هەفتە مۆڵەتت دەدەمێ . پێویستە ئەوەی ماوە بە باشی تەواوی بکەی ، دەنا دەبێ بگەڕێیت بۆ کۆرێکی ئاسانتر ... )) . سوپاسم کرد و چوومەوە ماڵەوە . ئەو دوو هەفتەیە ، نەك هەر شەو تا درەنگانێ دەمخوێندنەوە ، بەڵکو بۆ دەرزی ئەدەب و پەروەرشتیش ... یان نەدەچوومە پۆل و لە کتێبخانەی کۆلێژ دەمامەوە ، یان کە دەچووم لە دوای دواوە دادەنیشتم و خەریکی بەجێهێنانی فەرمانی ڤلادیمیر ڤیتڤیتسکی دەبووم ... سێ ڕۆژی مابوو دوو هەفتەکە تەواو بێ ، لە خوێندنەوەی سەرچاوەکان بوومەوە . ئەو سێ ڕۆژەی دوایی بە پەلە بەسەر بەشێکیاندا چوومەوە . بە دڵخۆشییەوە ڕۆیشتمەوە خزمەت مامۆستام و دەربارەی بەجێهێنانی ئەرکەکەم دوام ... هیچ ڕوویێکی خۆشم لێوە نەدی . وتی : (( با بزانم ... )) . بە پرسیار دایگرتمەوە ... ئەوی دەمزانی بۆم باس دەکرد ... ئەوەیش نەمدەزانی تێی‌دەگەیاندم ... من لە وەڵامدانەوە و گوێگرتندا تەواو ماندوو بوو بووم ، کەچی ئەو دەتووت تازە دەستی بە دەمەتەقێ کردووە ... کە لێبووینەوە ، پێی وتم : (( پێویستە لە خوێندنەوەدا خێراتر و وردتر بی )) . ئەوجا ناوی ژمارەیێك سەرچاوەی دی دامێ . بەم چەشنە چەند مانگێکم بەسەربرد . نزیك کۆتایی ساڵ داوای

لێکردم باسێك دەربارەی (( جیاکردنەوەی وشەی هاوبێژ و فرەواتا و هونەری ڕێکخستنیان لە فەرهەنگدا )) بنووسم . ئەمەم زۆر پێخۆش بوو ، چونکە لە پۆلی دووەمدا باسی وشەی هاوبێژ و فرەواتامان باش خوێندبوو . وێڕای ئەوە ، ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ماوەی ئەو چەند مانگەی پێشوودا خوێندبوومنەوە ، زانیاریی نوێیان دەربارەی ئەو بابەتە زۆر تێدا بوو . کەوتمە خۆم و باسێکی سێ لاپەڕەییم نووسی و بۆم برد . دوای ئەوەی هەفتەیێك لای بوو ، بۆی هێنامەوە . بینیم هەر خەتە و پێیدا هێنراوە ... هەموو تێبینییەکانی بۆ ڕوونکردمەوە و وتی : (( چاکیان بکە و هەفتەی ئاییندە بیهێنەوە بۆم )) . گشتیم چاك کرد و بۆم بردەوە ... کاتێ بۆی گەڕاندمەوە وتی : (( هەر ئەم لاپەڕەیەیان پێویستی بە نووسینەوە نییە . ئەوانی دی هەموو پڕن لە هەڵەی ڕێنووس و بۆم نیشانە کردوویت ... زوو چاکیان بکە ... )) . هەر ئەو شەوە چاکم کردن و پاکنووسم کردن . ئەمجارە نزیکەی پێنج لاپەڕەییێکی خستبووە لاوە و وتی : (( تەنیا ئەم چەند لاپەڕەیە پێویستیان بە نووسینەوە نییە ، دەنا ئەوەتا لە فلان لاپەڕەدا ، فلان پیت وا نییە و وایە ... فلانە وشەت پەڕاندووە ... ئەو لاپەڕانە بنووسەوە ... )) . وتم : (( ماموستا ! جا هەر لێرە چاکیان دەکەم و ئەوەی بۆچییە ... )) .

- نەخێر بیاننووسەوە ، چونکە وا فێری هەڵە نەکردن نابی ...

هیچ زێدە ڕۆیی نییە ، ئەگەر بڵێم بۆ نووسین و نووسینەوەی ئەو سی لاپەڕەیە پتر لە دووسەد پەڕە کاغەزم بەکارهێنابێ ... ئەوجا پاش ئەو هەموو ماندوویی و هێنان و بردنە ، نمرەییەکی وای دامێ ، هەر بەشی ئەوە بکات پێی دەربچم .

داوام لێیکرد ، کە بۆ هاوین ئەرکم بداتێ ... پێی وتم : (( هاوین بۆ حەوانەوەیە ... بێتو هاوین پشووی باڵی خۆت نەدەی و ساڵی نوێی خوێندن بە ماندوویی دەست پێبکەی ، ناگەیتە ناوەڕاستی ساڵ پەکت دەکەوێ ... بڕۆ بۆ گوێ دەریا ... مەلە بکە ... هەوای پاک هەڵمژە ... بگەڕێ ... کاتێ خوێندن دەستپێدەکاتەوە ، ئەگەر بێیتەوە کۆڕی فەرهەنگنووسی ، ئەوسا لە نۆژەنەوە تێهەڵدەچینەوە ... )) .

یەکەم ڕۆژی ساڵی نوێی خوێندن چوومەوە کنی و ئامادەیی خۆمم نیشاندا . وتی : (( بەڵێ پێم خۆشە ، بەڵام هەفتەیێک ماوەت دەدەمێ تا باش بیری لێبکەیتەوە ... بزانە ، نەک وات بۆ باشتر بێ لە مەیدانێکی دیدا شارەزایی پەیدا بکەی ... )) .

هەرچەندە دەمزانی یەکێک لە دوانەکەی دیی کۆڕەکەمان هەڵهاتووە و چووەتە کۆڕێکی دییەوە ، بەڵام من لەسەر بڕیاری خۆم مابووم ... بەهەمان شێواز کەوتینەوە کار ...

لە کۆتاییی ساڵدا سێ فەرهەنگی : (ڕووسی - ئینگلیزی ؛ ڕووسی - فەرەنسی ؛ ڕووسی - ئەڵەمانی)ی بۆ هێنام . تێیگەیاندم ، کە ئەو فەرهەنگانە وەك یەك ، ژمارەی وشە ڕووسییەکانیان چوار هەزارە . هەرسێکیشیان بۆ یەك مەبەست دانراون ، ئەویش یارمەتییدانی گەڕیدە و گەشتەوانانە . گشتیان یەك لایەن چاپی کردوون ... تەنیا دانەرەکانیان جیاوازن ...

- بزانە :

١ - لە هەرسێکیاندا چەند وشە وەك یەکن و ... چەند وشە جیاوازن ...

٢ - دوو دوو بەراوردیان بکە و ژمارەی وشەی وێکچوو و جیاواز دیاری بکە .

٣ - ئەگەر دەرکەوت جیاوازی لە نێوانیاندا نییە ، لێکیبدەرەوە هۆی چییە و ئەگەر جیاوازییش زۆر بوو یان کەم ، ڕوونی بکەرەوە لەبەر چییە ؟

لە ئەنجامی بەراورددا بۆم دەرکەوت لە نێوان هەر سێ فەرهەنگەکەدا تەنیا دوو هەزار وشەیێك هاوبەشن - واتە جیاوازی هێندەی یەکگرتنەوەیە . لە بەیەکگرتنی دوودوویاندا نزیکەی سێ هەزار وشەیێك وەك یەکن - واتە لەم بارەدا ڕادەی جیاوازییان ( ٢٥٪ )ە .

کارەکەم تەواوکرد و بردمەوە خزمەت مامۆستام و هۆی ئەو جیاوازییە زۆرەشم وا بۆ باس کرد ، کە نووسەرانی ئەو فەرهەنگانە لەبەر ئەوەی وشەیان لەسەر بنەما و

بنچینەیێکی زانستی هەڵنەبژاردووە ، وشەکانیان وا لەیەك دوورن ... ئەگەرچی ڕا و بۆچوونەکەمی پێ باش بوو ، گەلێ زانیاریی دیبیشی دامێ ... ئەوجا پێی وتم : (( ئەمەش بکە وتارێك )) . ئەمیشم تەواوکرد و ئەمجارەش زۆری بۆ چاككردم و چەند جارێك پێی نووسیمەوە . لە کۆتاییدا نمرەیێکی مام ناوەندیی بۆ دانام و لێی پرسیم :

ـ هێشتا هەر لەسەر ئەو ڕایە ماوی ، کە فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی دابنێیت ؟

ـ دوودڵم ...

ـ جارێ لە کوێتە ...

لە پۆلی پێنجەمدا ، خۆم کەوتمە سەر بیری ئەوەی ، کێشەی ( چۆنێتی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگ ) بکەمە باسی نامەی ماجستێرەکەم . ئەمەم بە مامۆستام ڕاگەیاند و پەسەندی کرد ، کە ( فەرهەنگی گیرفان ) یەکجار زۆر چاپ کراوە . دەوروبەری بیست فەرهەنگێکم کۆکردەوە ، کە گشتیان بۆ یەك مەبەست دانرابوون و یەك دەزگا چاپی کردبوون . هەر لە سەرەتادا بۆمان دەرکەوت ، کە ڕێبازی زانستی بۆ هەڵبژاردنی وشە ڕەچاو نەکراوە . دە فەرهەنگێکیان هەشت هەزار وشەیان گرتبووە خۆ ، ئەوانی دیيان حەوت هەزار ، یان نۆ هەزار وشەیێك بوون . ناچار هەشت هەزارییەکانمان وەرگرت ـ واتە وشەکانی ئەو دە فەرهەنگە بوونە کەرەستەی خاوی نامەکەم ... جیاوازیی یەکجار زۆر و سەرسوڕهاوەرم تێدا

دۆزینەوە ... مامۆستام داوای لێکردم سەفەرێکی مۆسکۆ بکەم و بچمە لای دانەرەکانیان و لێیان بپرسم لەسەر چ بنەمایێك وشەیان بۆ فەرهەنگەکانیان هەڵبژاردووە ... سەفەرەکەم خستە پشووی نیوەی ساڵ ، بۆ ئەوەی بە بەردێك دوو نیشان بشکێنم ، ئەویش بەوەی هەموو ساڵێك لەو دەمەدا کۆنگرەی خوێندکارانی کورد دەگیرا ... لە مۆسکۆ چاوم بە زوربەیان کەوت . هیچیان وەڵامێکی ئەوتۆیان نەدامەوە و زانیارییێکی وایان نەدامێ ، کەڵکی لێببینم ... زۆر خەمبار و خەمگین بووم ... تاکە خۆشییێك ، کە کەمێ برینی سارێژکردم ، سەردانی ماڵی خاتوو ( یو . ئا . دۆبرۆڤۆلسکایا )ی ناسك و نازداری دانەری فەرهەنگی ڕووسی ـــ ئیتالیایی بوو ... لە کۆنگرەی خوێندکارانی کوردیشدا چاوم بە ( ئیڤان فاریزۆڤ )ی[1] خۆمان کەوت و تێم گەیاند ، کە بۆ کارێکی لەو چەشنە ، حەزدەکەم ماوەیێك لەگەڵی دابنیشم ... لێی پرسیم :

- ئەمەت بۆچییە ؟

- بۆ ئەوەی بیکەمە ڕێخۆشکەری بنچینەی هەڵبژاردنی وشە بۆ فەرهەنگێکی ڕووسی - کوردی ...

- جا ئەو خۆ خەریك کردنەی بۆچییە ؟ ... وشەکانی فەرهەنگەکەی من وەربگرە ... ئەو فەرهەنگانەی تۆ

---

(١) ( ئی . ئۆ . فاریزۆڤ )ی دانەری فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .

باسیان دەکەی هەشت هەزار وشەی ڕووسییان تێدایە ، ئەوی من سی هەزارە ... زۆر لەوان پترە ...

- ئاخر مامۆستا ئامانجی ئەو فەرهەنگەی من بە تەمایم ، لەگەڵ ئەوی تۆدا جیاوازە . ئەوی من فەرهەنگی گیرفانە ... ئەوی تۆ ...

- ئەو قسانە چی‌یە ... من فەرهەنگێکی ڕووسیی - ئینگلیزیم هێنا ... ئەوی زانیم کردمە کوردی . ئەوی نەشمزانی وازم لێهێنا و بۆشیان چاپ کردم و ...

کە گەڕامەوە لێنینگراد ، تەنیا باسی خاتوو ( یو . ئا . دۆبرۆڤۆلسکایا ) نەبێ ، هەموو ئەوی دیم بە دوور و درێژی بۆ ڤ . ڤیتڤیتسکی گێڕایەوە . ئەویش سەری لەقاند و وتی : (( گومانم لە قسەکانت نییە . دەزانم لەم وڵاتە پێشکەوتووەی ئێمەشدا ، زۆر فەرهەنگ لە ڕێی چاولێکەرییەوە دانراوە ... زۆرتری فەرهەنگ‌نووسەکان لە زانستی فەرهەنگ‌نووسیدا زانیارییان نییە ... )) .

(( بنچینەی هەڵبژاردنی وشە بۆ دانانی فەرهەنگێکی گیرفانی (( ڕووسی - کوردی ))م کردە ناوی نامەی ماجستێری‌یەکەم و بە چەند مانگێك تەواوم کرد و دوای ڕەچاوکردنی تێبینی‌یەکانی ڤ . ڤیتڤیتسکی و چەند جار نووسینەوە ، چاپم کرد و بردم بۆ مامۆستام . پاش سێ هەفتەیێك بۆی هێنامەوە و بۆ یەکەم جار لە ماوەی سێ ساڵدا ئافەرینێکی کردم و بە ڕوویێکی خۆشەوە وتی : ((هەر ئەمڕۆ نامەکەت دەخەمە بەر دەستی

بەرپرسیاران ... دڵنیام لە لێدواندا سەرکەوتوو دەبی ... )) .

ڕۆژی لێدوان ، هەردوو پسپۆڕی لێدوو ڕایان بەرانبەر نامەکەم زۆر باش بوو ، وێڕای ئەوەی نمرەی هەڵاوێردەیی‌یان بۆ دانام ، داواشیان کرد دەرفەتی خوێندنی دوکتۆرام بدرێتێ .

مامەڵەکەم کەمێ درەنگ گەیشتە وەزارەت ، لەبەر ئەوە وەرگیرانم بۆ خوێندنی دوکتۆرا خرایە ساڵی دادێ .

ئەگەرچی چەند مانگێك دەبوو بیر و ئارەزووی دانانی فەرهەنگێکی ڕووسی ـ کوردیم لە مێشکدا نەمابوو ، لەبەر ئەوەی ئەو ساڵی بێ خوێندنە دەست بەتاڵ بووم ، بڕیارمدا خۆم لە دانانی ئەو فەرهەنگەدا تاقی‌بکەمەوە ــ وشە ڕووسییەکانم لەسەر بنچینەیێکی زانستی و ئەزموونگەری هەڵبژاردبوو و مانا لێکدانەوەیان مابوو ... هەشت مانگێك بێ‌وچان پێوەی خەریك بووم . چەند هەزار وشەییێکم لێ گەلاڵە کردن ... تەگەرەی گەورە گەورە دەهاتە ڕێم ... کە سەیری فەرهەنگەکانی بەر دەستم دەکرد ، دەمبینی لە لێکدانەوەی مانای وشەشدا هەمان پاشاگەردانی‌یە ، کە لە هەڵبژاردنی وشەشدا بەرپا بووە ... هەرچەندە حەیفم لێ دەهات ، ئەو هەموو کارتە وا بێ‌ناز بەجێ‌بهێڵم و ئەو هەموو ڕەنجەم وا بە فیڕۆ بڕوا ، هەر بڕیارمدا دەست لەو کارە هەڵبگرم و تا لە کێشەی

لێکدانەوەی مانای وشە و کێشەکانی دیدا شارەزاییی باش پەیدا نەکەم ، نەچمە ئەو مەیدانەوە .

ڕاستە وازهێنان لەو کارە بووە مایەی ناڕەحەتی بۆم ، بەڵام کەڵکی ئەوەشم لێوەرگرت کە لە بواری پراکتیکی فەرهەنگ‌نووسیدا ، کەمێ شارەزایی پەیدابکەم و بە هۆی ئەوەوە بتوانم بابەتی نامەی دوکتۆرییەکەم دیاری بکەم ، کە ئەویش چوونە ناو سەرجەمی کێشەکانی کاری فەرهەنگ‌نووسی بوو .

لە هەمان کۆلێژی ئادابی زانستگای لێنینگراد بە خوێندکاری خوێندنی دوکتۆرا وەرگیرام ... زوو تێگەیشتم ، کە بەجێهێنانی ئەم کارەی ئێستام پێویستی بە سەرپەرشتێکی زمانەوانی کوردی ، ڕووسی زانە . لەبەر ئەوە داوام کرد بمگوێزنەوە بۆ ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیای سۆڤێتی لێنینگراد ... پاش مانگێك لەو ئامۆژگایە بوومە شاگردی پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ ( کوردۆیێڤ ) . هەتا دوو مانگێك نێوانمان باش نەبوو ، ئەو دەیویست من واز لە باسی فەرهەنگ‌نووسی بهێنم و بابەتی نامەکەم بکەمە باسێکی ڕێزمانی . نە ئەو لەسەر ڕای خۆی لادەچوو و نە من لە پرۆژەی خۆم پەشیمان دەبوومەوە . لەو ماوەیەدا د . کەمال مەزهەر سەرێکی لە لێنینگراد دا و باسەکەم بۆ گێڕایەوە . سوپاس بۆ ئەو ، کە توانی کەمێ نەرمی بکاتەوە و ڕازیی بکات ... ئەگەرچی لە سەرەتادا هەر لە دڵی دەرنەدەچوو و

هەندێ وشك بوو لەگەڵم ، لە ماوەیێکی کەمدا توانیم تەواو کاری تێبکەم و وامان لێهات بووینە باوك و کوڕ ؛ بە هاوڕێی گیانی بەگیانی بووم ؛ بە جێی متمانەی تەواو و یەکەم کەسی نێزیکی . بەڵگەی ئەم قسەیەشم ، ئەو دۆستانەن ، کە لەو ماوەیەدا لە گەڵماندا بوون ، ئەو نامانەشن ، کە دوای گەڕانەوەم بۆ وڵات ، بۆی ناردووم ... تەنانەت ، کە هاوینانیش سەری لێنینگرادم دەدایەوە ، یەکەم ڕۆژ دەهاتە لام و تا شەو درەنگ لام دادەنیشت و بە زۆر بۆ چەند ڕۆژێك دەیبردینە ڤیلایەکەی قەراخ شاری لێنینگرادی و بەو پیرییەوە میدیای کچمی دەکردە کۆڵی ...

لە ماوەی دوو ساڵدا نامەکەم تەواوکرد ، بەڵام لەبەر ئەوەی لەو دەمەدا یاسایێکی عیراقیی سەیر و سەمەرە هەبوو ، کە ئەگەر خوێندکاری دوکتۆرا بە سێ ساڵ کەمتر بڕوانامەی دوکتۆرا وەربگرێ ، ددان بە بڕوانامەکەیدا نانرێ[٢] . بۆ ئەوەی خۆم تووشی بەڵای نەفامیی ئەو نەزانانە نەکەم ، نامەکەم لەسەر مێزەکەم دانا . ماوەی ئەو ساڵەی مابووم ، خۆم بە نووسینی چەند وتارێك و وەرگێڕانی کتێبی (( هەندێك بیر و باوەڕی هەڵە لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە ))ی قەناتی کوردۆوە خەریك کرد ... ئەوجا لە کاتی قانوونیدا بەسەرکەوتوویی

---

(٢) بەپێچەوانەوە ، لە شوێنانی دی ، یەکێك پێشتر تەواوی بکا پاداشتی دەدەنێ و ڕێزی تایبەتی لێدەگرن .

وتوویـژی لـەبارەوە کـرا و نامەکـەم مایـەی ڕەزامـەندیی هەموان بوو .
کاتێ گەڕامەوە ولآت لە (کۆڕی زانیاری کورد) دامەزرام . ئەم دەزگایە نیازی دانانی فەرهەنگێکی گەورەی کوردیی هـەبوو و منیـان خسـتە سـەر ئـەم کـارە . داوام لـە بەرپرسـیاران کـرد مـانگێك مۆڵـەتم بـدەن ، بـۆ ئـەوەی نەخشەی کارەکە بکێشم و بنچینـەی چۆنێتـی نووسـینی فەرهەنگەکە دابڕێـژم . ڕێگـەم پـێ درا و منیـش ڕاپۆرتـی خۆمم نووسی . داوای کارتێکی زۆریشم کردبوو بۆ ئەوەی بکرێنە فیشە ، تا بە پێی سیستەمی کارت ـ نووسینی هەر وشەیێك لەسەر کارتێك ـ دەست بە کار بکەین . مامۆستا ئیحسـان شـێرزادی سـەرۆکی دڵسـۆزی کـۆڕ ، دەیویسـت دەفتـەرێکی گـەورە بـۆ ئـەو مەبەسـتە بـەکاربێنین . لـەم کێشەیەشـدا دیسـان د . کـەمال مەزهـەر قەناعـەتی بـە سـەرۆکی کـۆڕ کـرد و پێـی وت ، ئـەورەحمان خـۆی لـە کارەکەی باشتر دەزانێ ، با لێی بگەڕێن ، چۆنی بـەلاوە باشە وا بکات ...
بە دڵ و بە گیان کەوتمە کـار ... لـەو کەرەسـتە زۆرەی فۆلکلۆری کوردی کە چەند لیژنەیێك بە ڕاسـپێریی کـۆڕ چووبوون لە دێهاتەکان کۆیان کردبووەوە ، سەدان وشـەی وام وەرگرتبوون ، لە هیچ فەرهـەنگێکی کوردیدا نەبوون . بەشی زۆری فەرهەنگە کوردییەکانیشـم دایـە خەتخۆشـان بیانخەنـە سـەر کارت ... هـەندێ فەرهـەنگیش ، وەك ئەوی

لێرخ و یەگیزارۆڤ و ... کە خستنە سەر کارتیان بە خەڵکی دی نەدەکرا ، خۆم شەوانە خەریکیان دەبووم ... هێندە ئاسۆی ئەو فەرهەنگەم ڕوون دەبینی و بڕوام بە خۆم وا بەتین بوو ، تەنانەت لە پوختەی کارەکانی کۆڕدا وام ڕاگەیاند ، کە (( فەرهەنگی کۆڕ ـــ فەرهەنگی یەکگرتووی کوردی - ئیشی لەسەر دەکرێ و هەندێ کاری تەواو بووە . ئومێد دەکەین بەم زووانە چەند پیتێکی سەرەتای بخەینە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز ))[٣] .

بەهاری ساڵی ١٩٧٤ ، کە لە کۆتایی قۆناغی وشە کۆکردنەوە نزیك بووینەوە ، کۆڕ خامۆشیی تێکەوت . منیش ئەگەرچی وردە وردە لە خڕکردنەوەی وشەدا بەردەوام بووم ، بەڵام ساردبووبوومەوە و بە ئارەزووەوە کارم پێنەدەکرا . خەریك‌بوونیشم بە کاروباری کارگێڕی و دەرکردنی گۆڤاری کۆڕەوە بوونە هۆی ئەوە ، کەمتر بمپەرژێتە سەر ئیشی فەرهەنگەکە ... ساڵی ١٩٧٥یش ، دوای ئوشوست‌هێنانی شۆڕشەکەمان : نەهاتنەوەی مام هەژار و لابردنی سەرۆکی کۆڕ و ڕاگوێزانی د . کەمال مەزهەر و پاشان خانەنشین کردنی مامۆستا مەسعوود محەمەد و فشار خستنە سەر کارمەندانی دەزگاکەمان و ویستی میری بۆ هەڵوەشاندنەوەی (کۆڕی زانیاری کورد) ،

---

(٣) د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، پوختەی کارەکانی کۆڕ ، (( گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد )) ، ب ٢ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٥٥٢ .

وایان لێکردم بەیەکجاری دەستبەرداری کاری فەرهەنگ بم ... چونکە دانانی فەرهەنگێکی وەها ، ئەگەر لە بارێکی هێوەردا ، بە ماوەی چەندین ساڵ و بە لیژنەیێکی کارامە بتوانرێ بگەیەنرێتە ئەنجام ، چۆن بە لیژنەییێکی هەر بەناو لیژنە و لە بارودۆخێکی یەکجار سەخت و ناخۆش و ئاسۆییێکی تاریکی بێ هیوای وەك ئەوەی ئەو ڕۆژەدا ، کاری مەیسەر دەبێ ؟ ...

پاش ماوەییێك کۆڕی زانیاری کورد هەڵوەشێنرایەوە و بە پێی یاسای ژمارە ١٦٣ی ڕۆژی ١٩٧٨/١٠/٤ کرایە دەستەییێك لە ( کۆڕی زانیاری عیراق ) . ئەگەرچی ، ئەم دەستە دەستکورتە لە سەرەتادا چەند لیژنەییێکی بۆ هەندێ بابەتی زانستی دامەزراند ، بەڵام هیچ بیری لە لیژنەی فەرهەنگ نەکردبووەوە ...

دوای چەند ساڵێك سەرۆکی کۆڕی زانیاری عیراق و چەند ئەندامێکی دەستەی کوردیی کۆڕ ، کەوتنە بیرکردنەوە لەوە هەندێ لە کارمەندانی کۆڕ ، بەتایبەتی من و مامۆستا شوکور مستەفا فەرهەنگێکی عەرەبی - کوردی دابنێین . من بەش بە حاڵی خۆم بە هیچ چەشنێك نەچوومە ژێر باری بەجێهێنانی ئەو نیازەیان . پاش ساڵێك فەرمانی کارگێڕییم بۆ ئەم کارە دەرکرا و من دیسان هەر گوێڕایەڵیم نەکرد ... بەڵێ من دەمزانی نەك فەرهەنگی عەرەبی - کوردی ، بەڵکو هەموو جۆرە فەرهەنگێك پێویستە و کەڵکی هەیە ... بەڵام ئەگەر

ئەندامانی دەستەی کۆڕی زانیاری عیراق بەڕاستی مەبەستیان بوایە فەرهەنگێ ئامادە بکرێ ، دەبوو بەر لە هەرچی ، هەوڵ بدەن کار لەو هەزاران کارتەدا بکرێ ، کاتی خۆی کۆمان کردبوونەوە و چەند ساڵ بوو لە یەکێك لە ژوورەکانی کتێبخانەی کۆڕدا بێناز و بێخاوەن کەوتبوون و تۆز کەڵەکەی بەسەریانەوە کردبوو ... لە ئەنجامدا من لە کۆڕ نەمام و گوێزرامەوە بۆ بەشی کوردیی کۆلێژی پەروەردەی زانستگای بەغدا . لەم شوێنە نوێیەم کرامە مامۆستای ئەلفوبێ و ، وتووێژ و ڕێزمانم بە قوتابیانی عەرەبی هیچ لە کوردی نەزان دەڵێمەوە ... بەڵام من چ لە کۆڕی زانیاری کورد و چ لە کۆڕی زانیاری عیراق و چ لە کۆلێژی پەروەردە ، بارودۆخ هەرچۆنێکبووبێ ، نەمهێشووە کاتم زۆر بە فیڕۆ بچێ . لە مەیدانی پان و بەرینی زمانەوانیدا بێوچان کارم کردووە و بەرهەمی خۆمم پێشکەش بە نەتەوە خۆشەویستەکەم کردووە .

سەرەتای ساڵی ۱۹۹۲ لە نووسینی بەشی پێنجەمی بەرگی یەکەمی کتێبی (( ڕێزمانی کوردی - ( کردار ) )) بوومەوە و بەم چەشنە چوار کتێبم بە پاك نووس کراوی لەسەر مێزەکەم بێخەمخۆر هەڵچنرابوون[٤] و هیچ

---

(٤) ا) ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ( وشەسازی ) ، بەشی چوارەم ( ژمارە و ناوەڵکردار ) .

ب) سەرەتایێکی زمانناسی ، بەرگی یەکەم . لە ڕووسییەوە وەرگێڕراوەتە سەر کوردی .

ئومێدێکی لە چاپدانی بەم نزیکانەیان دیار نەبوو ... لەو دەمەشەوە بڕیارم دابوو هیچ لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی میریدا بڵاونەکەمەوە(٥) . ئەم وەزعە بیری ئەوەی خستە مێشکمەوە خۆم بە کارێکی گەورەی درێژخایەنەوە خەریك بکەم ، کاری گەورەی درێژخایەنیش ، بەش بە حاڵی کەسێکی وەك من ، ئەگەر فەرهەنگی کوردی ـ کوردی نەبێ ، دەبێ چی بێ ؟

بەم خەیاڵەی خۆم زۆر دڵخۆش بووم ... بەڵێنم دا ئەو خەون و ئاواتە کۆنەم بێنمە دی ... قۆڵم لێهەڵکرد و بۆی چوومە خەڵوەتەوە . یان بەیانیان مەلابانگدان لە خەو هەڵدەستام ، یان شەوانە تا درەنگانێ کارم تێدادەکرد ... لە ڕۆژێکدا هێندەی دوو ڕۆژی جاران ئیشم دەکرد . وام لێدەهات لە پەل وپۆ دەکەوتم . ورەی بەرز و هیوای بەتینم گشت ماندووبوونێکمیان دەرەواندەوە و لەبیردەبردمەوە . ئەزموونی دەیان ساڵ و تەمەنیش فێریان کردبووم گیروگرفتەکان لە جاران چاکتر چارەسەربکەم . لە ماوەی چوار ساڵدا فەرهەنگەکەم تەواو کرد و وا دەستم کرد بە پاکژکردن و نووسینەوەی .

---

- جـ) چیرۆکی هەڵبژاردە . بیست کورتە چیرۆکە لە ڕووسییەوە وەرگێڕراوەتە سەر کوردی .

د) ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ( وشەسازی ) ، بەشی پێنجەم ( کردار ) .

(٥) ئەو نووسینانەی دوای ئەو ماوەیە بڵاوکراونەتەوە ، چەند ساڵێك پێش ئەو بڕیارەم بۆ چاپ وەرگیرابوون .

ئومێدەوارم بەری ئەم ڕەنجەی تروسکایی دیدەمی تەواو کزتر کرد و خۆیشمی شاد و کامەران ، بە دیاریی ئەمەك و وەفــا لێ قویــوولْ بکــرێ و جێــی ڕەزامــەندیی هــەموو دڵسۆزانی زمانی کوردی بێ .

ئەوڕەحمانی حاجی مارف
١٩٩٦/٤/٣

## نیگایێک

لەبـەر ئـەوەی هەڵـەبژێریی چـاپی هـەندێ بەرهـەمم ، تووشی ڕەشبینی کردبووم و لەو ساڵانەشدا نە کۆمپیوتەر هێشتا پەرەی سەندبوو و ، نە گیرفانم هێندە پڕ بوو پارەی ئـەو کـارە گەورەیـەی پێ‌هەڵسووڕێ ، بڕیـارم دابـوو بـە خـەتێکی وردی جوان بینووسمـەوە و بە فۆتۆکۆپـی سـەد دانەیـەکی لێ ڕابکێشـم و پێشـکەش دەزگـا زانسـتی و کتێبخانە گشتی‌یەکانی بکەم . لە ماوەی سێ مانگێکدا بە خـەتێکی ورد و جـوان بـۆم کـرا تـەنیا (١٠٣) لاپـەڕەی لێ‌تەواو بکەم و ، ئەوە وێنەی سێ لاپەڕەی (٢٤) و (٧٦) و (٩٦)ی :

لەپڕ نەرمە شەپڵەیەك (شلل) لێیدام ... ناچار کەوتمە بیرکردنەوەی چوونە هەندەران . بۆ ئەو مەبەستە سەرێکی سلێمانیم دا ، تا لەوێوە ڕێگای ئەورووپا بگرمە بەر ... بەو نەخۆشییەوە ، پەرۆش و ئەمەك و وەفا گەیاندمیانە لای ئازیزان و خۆشەویستانی بەشی کوردیی کۆلێژی زمان ، کە زۆرینە و زۆراتییان چ لە خوێندنی بەکالۆریۆسدا ، یان لە خوێندنی ماجستێردا دەرزم پیّوتوون ... دەوریان دام و هانایان بۆ هێنام ، خوێندنی دوکتۆرا بکەینەوە ... بەندەش خۆی و نەخۆشییەکەی و ئەورووپا ...ی بیرچووەوە . ئەو دەمە ، کە دوکتۆر زاهیر لەتیف ڕاگری کۆلێژ و د . جەلال شەفیق سەرۆکی زانستگا و کاك کۆسرەت ڕەسووڵ عەلی سەرەك وەزیران بوون ... کوردانە و گوردانە لە ماوەی دوو هەفتەیەکدا هەموو کارێکیان مەیسەر کرد ... ئیتر ئێمەش : د . عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ و د . زاهیر لەتیف و بەندە و ، دواتریش د . محەمەد مەعرووف فەتاح کەوتینە گەر ...

کاری زۆر و گرانی خوێندنی باڵا و سەرپەرشتیکردنی نامەی خوێندکاران و بڵاوکردنەوەی ئەو چوار کتێبەی هەر لە زووەوە بۆ چاپ ئامادەبوون و پێشتر ناوم بردن و نووسینی هەندێ کتێبی دی و پەخش کردنی چەندین وتار بە نازناوی جۆراوجۆرەوە ... لە کاری فەرهەنگەکەیان دابڕیم .

ئێستا چەند کارێکی تەواونەکراوم لەبەر دەستدان ، بە هیوا و هومێدم لە ماوەی ساڵێکدا بیانگەیەنمە ئەنجام و ، شاد و بەختەوەر دەبم ، گەر بیر و هزری هیچ بابەتێکی دی نەمبزوێنێ و هەموو کاتم بۆ کارە سەرەکییە پیرۆزەکەم - کە فەرهەنگەکەیە - تەرخان بکەم ... بەڵام ئەورۆ (٢٠٠٦/٩/١١) فایلی پاکنووسی ئەو فەرهەنگە نازدارەمم کەوتە بەر دەست ... کە ڕوانیم سەرجەمی لاپەڕەکانی زەرد هەڵگەڕاون ، خەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرتم ... پاش هاتنەخواریی چەند تنۆکێك فرمێسك بە چاوەکانمدا و ڕامان و بیرکردنەوەیەکی قووڵی پڕ کەسەر ، بڕیارم دا بەشێك لە نووسینەکانی بەر دەستم ڕابگرم و هەفتەی دوو ڕۆژێك بۆ بەجێهێنانی ئەرکی فەرهەنگەکەم دابنێم ...

ئەوەتە ، دوای ئەم چەند دێرە ، لە وشەی (( ئاس ))ەوە دەست پێ دەکەم ، کە (١٠) دە ساڵێك لەمەوبەر بێ ئەوەی لێکیبدەمەوە وەك دوا وشە تۆمارم کردبوو و ئەو ماوە دوور و درێژە ، ئەو و سەرجەمی وشەکانی دی چاوەچاوی نووکی قەڵەمی بەندەیان دەکرد ...

لێتان ناشارمەوە و نایکەمە نهێنی و پەنامەکی ... ئەوە پتر لە مانگێك تێپەڕیوە و هێشتا تاکە وشەیەك چییە نەمخستووەتە سەر ئەم خەرمانە ... جا بۆ ئەوەی ئاوەز و ئارەزووم وام بهەژێنن ، کە هەموو سەنگ و قورساییەکم بخەمە سەر ئەم بەرهەمە گەورە پشتگوێخراوەم و

دەستبەرداری گشت کارەکانی دیم ببم ، بڕیارم دا ، ئەوەی (١٠) ساڵێك لەمەوبەر پاکنووسم کردبوو ، با کەمیش و سەدی پێنجی فەرهەنگەکە بێ ، کۆمپیوتەر بکەم و بیخەمە بەر دیدەی خوێنەری کوردی هێژا ...

ئەوڕەحمان

٢٠٠٦/١١/٣

## چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم فەرهەنگە و مەبەست و بارست و پێکهاتن و ڕێکخستنی

هەر لە سەرەتاوە ئەوەم لەبەرچاو گرتبوو وشەی گشت شێوەیێکی کوردی و هەموو ناوچەیێکی کوردەواری کۆبکەمەوە و لە نێو ئەم فەرهەنگەدا تۆماریان بکەم ، بەڵام چاك دەزانم ، هەزاران وشە هەن دەستم نەیانگەیشتووەتێ ... لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەی وشەکانی ئەم فەرهەنگە خۆی لە سەد هەزارێك دەدا ، بۆیە بە ڕاشکاوی دەڵێم لە ڕووی چەندێتییەوە لە سەرجەمی ئەو فەرهەنگە کوردییانەی بە چاپ گەیاندراون زیاترە .

بەپێی مەبەستی ئەم کارە و یاسا و دەستووری فەرهەنگنووسی ، گەلێ وشەم هەڵبواردووە ، وەك : ناوی تایبەتیی کوڕان و کچان ( ئازاد ، شیروان ، لاوك ... شنە ، نازەنین ، هاژە ... ) . ناو و نازناوی شاعیر و نووسەر و هونەرمەند و ناوداران : ( خانی ، گۆران ، مەم ... سێوە ... نۆدێیی ... ) . ناوی جوگرافیایی : ناوی چیا ( پیرەمەگروون ، هەڵگورد ... ) ؛ ناوی ڕووبار ( تانجەرۆ ، سیروان ... ) ؛ ناوی گوند و شار و وڵاتان ( بیارە ، ماردین ، تاران ، ئەمەریکا ... ) ؛ ناوی تیرە و خێڵ و هۆز و میللەتان ( جاف ، سوورچی ، هەرکی ، فارس ، تورك ... ) ... چونکە ئەم فەرهەنگە فەرهەنگی وشە لێکدانەوەیە و فەرهەنگی ئینسکلۆپیدیایی نییە .

هەروەها ئەو وشە و زاراوانەی لەم ساڵانەی دواییدا دانراون و دارێژراون و وەرگیراون و هێشتا لە زمانی کوردیدا نەچەسپاون ، لەم فەرهەنگەدا تۆمارم نەکردوون .
کاتێ دەشێ ئەو جۆرە وشە و زاراوانە بخرێنە نێو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە ، کە گومان لە بنج و ڕیشە داکوترانیان نەمابێ و بەتەواوی جێی خۆیان کردبێتەوە و چووبنە ڕیزی وشەکانی دیی زمانەوە .
بەپێچەوانەوە ، سەدان وشەی ئەسڵ عەرەبی و تورکی و فارسی و فەرەنگی ، وەك : ( ئاتاج ، ئاخر ، ئاخرخێر ، بەتاڵ ، بەقاڵ ، خەڵك ، شێخ ... ئاچغ ، باجی ، بڕنووتی ، یاپراخ ... ئاجیل ، ئەختەر ... ئاجودان ، ئادرێس ، بلوور ، بلیت ... ) ... کەوتوونەتە ئەم فەرهەنگەوە ، چونکە تێکەڵ بە زمانەکەمان بوون ، هەمیشە لەسەر زار و زمانی بەشێ لە کوردانن و بوونەتە ماڵ و موڵکی خۆمان .
گەلێ وشەی تر هەن لە فەرهەنگە کوردییەکانی دی دا بەرچاودەکەون و لەم فەرهەنگەدا بەدی ناکرێن . ئەمەش لەبەر ئەوە نییە ، کە لەو بڕوایەدابم ، ئەو وشانە لە زمانی کوردیدا نەبن ، بەڵکو هۆی ئەوەیە ، نازانم هەن یان نا ... سەرپاکی ئەو وشانەی کەوتوونەتە ئەم فەرهەنگەوە جەختی تەواو لەسەر بوونیان کراوە ، ئەوجا تۆمارکراون .
زوربەی فەرهەنگە کوردییەکان نیشانە و پاشگر و پاشبەندی وەك ( ـ ان ، ـ ەکە ، ـ ێك ... اندن ، ـ ایەتی ، ـ ێنی ... ـ ەوە ، ـ ڕا ، ـ دا ... )یان وەك وشەی فەرهەنگی

تۆماركردووه و مانايانيان لێكداوەتەوە . وێڕای ئەوەش پیتی هەمزەیان لە پێشیانەوە داناوە و لە شێوەی ( ئان ، ئەکە ، ئێك ... ئاندن ، ئایەتی ، ئێنی ... ئەوە ... )دا نووسیویانن . لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە ئامرازانە بەتەنیا بەکارناهێنرێن و لە سەرەتای وشەوە نایەن و کاتێ لە کۆتایی وشەدا بەکاردەهێنرێن ، دەنگی ( ئـ ) وەرناگرن ... بۆیە (( فەرهەنگی میدیا )) نەیگرتوونەتە خۆ . ڕاستییەکەی ئەوانە دەبێ بکەونە باسی ڕێزمانەوە .

ئەگەرچی ئەم فەرهەنگە ناتوانێ وەك کتێبێکی ڕێزمان هەموو بار و دۆخێکی ڕێزمانی ساغبکاتەوە ، بەڵام هەندێ لایەنی گرنگی ئەو مەبەستەی دیاری کردووە ، وەك : ١) نیشانی داوە هەر وشەیێك سەر بە چ بەشە ئاخاوتنێکە . بەوێنە : ئا ـ ئامرازە ؛ بەرد ـ ناوە ؛ تۆ ـ جێناوە ؛ جوان ـ ئاوەڵناوە ؛ ئابڕووبردن ـ چاوگی تێپەڕە ؛ ئابڕووچوون ـ چاگی تێنەپەڕە ؛ ئابڕووبەر ـ ناوی کارایە ؛ ئابڕووتکاو ـ ئاوەڵناوی بەرکارە ... ٢ ) جۆری ڕۆنانی وشە ناسادەکانی یەکالاکردووەتەوە . بۆ نموونە : ئابڕووبەرە – ئابڕوو + بـ ( بردن ) + ەر + ە ؛ ئاودەستخانە + ئاو + دەست + خانە ؛ بەرچنە – بەر + چن ( چنین ) + ە ؛ پشتاوپشت – پشت + او + پشت ؛ ڕەشەبا – ڕەش + ە + با ...

ڕاستە ئەم بەرهەمە لێکۆڵینەوەیێکی ئێتیمۆلۆژی نییە ، بەڵام توانیوێتی هەندێ ڕووی ئەسڵ و سەرچاوەی

بەشێکی وشەکان نیشان بدا . وەك : ( ئازاد ) وشەیێکی کوردییە و لە ئاوێستادا ــ ( ئازاتە ) و لە پەهلەویدا ( ئازات )ەیە . ( ئاسمان ) : ئاوێستا ( ئەسمەن ) و پەهلەوی ( ئاسمان ) ؛ ( ئاشتی ) : ئاوێستا ( ئافشتی ) و پەهلەوی ( ئاشتیە ) ؛ ( ئاشنا ) : ئاوێستا ( ئافشتا ) و پەهلەوی ( ئاشناك ) ... ( بووم ) بە واتای ( ئەرز ، خاك ، زەوی و وڵات ) : ئاوێستا ( بوومی ) ؛ پەهلەوی ( بووم ) ؛ سانسکریتی ( بهوومی ) ... ( ئاتاج ) لە ( ئیحتیاج )ی عەرەبییەوە ؛ ( بوختان ) لە ( بهتان )ی عەرەبییەوە ... ( بۆیاغ ) لە تورکییەوە ؛ ( ئابوونە ) لە فەرەنسییەوە ؛ ( بوتڵ ) لە ئینگلیزییەوە ؛ ( سەماوەر ) لە ڕووسییەوە ...

لە بارەی شێوەناسی و شێوازناسییشەوە تەنیا هێندەمان پێکراوە ، چ بە دانانی نیشانە بە دوا وشەدا ، یان بە هێنانەوەی نموونە لە سەرچاوەی جۆربەجۆرەوە ڕاییبگەیەنین و ڕوونی بکەینەوە ، کە فلانە وشە لە کام شێوە و ناوچەدا دەوترێ و لە چ بوار و مەیدانێکدا بەکاردەهێنرێ .

بەوێنە ، کە بە دوا وشەی ( ئاخمە )دا نیشانەی ( د )مان داناوە ، ئەوەمان بەوە ڕاگەیاندووە ، کە ئەو وشەیە لە شێوەی (دملکی)دا بەکاردەهێنرێ . یاخود ، کە بۆ وشەی (ئابڕوو) نموونەمان لە پیرەمێرد و تحفەء مظفریە و بەیتی دمدمی ـ عەبدولحەمیدی حوسەینی و لەیلێ و مەجنوونی هەورامانی ...یەوە هێناوەتەوە ، ئەوە دیارە مەبەستمان

ئەوەیە ، لە هەموو ئەو شێوانەدا و لە زمانی ئاخاوتنیش و ئەدەبیشدا لە کاردایە ...

وشە فەرهەنگییەکان بە خەتی ڕەش چاپکراون و بە پێی چاولێکەریی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ( بە کەمێ دەستکارییەوە ) ڕیزکراون . یەکەم ـ ڕوونکردنەوەی وشە ( ئەوەی پێویستی بە ڕوونکردنەوە بێت ) ، دیاریکردنی باری ڕێزمانییەتی ـ واتە سەر بە کام بەشە ئاخاوتنە و چۆن ڕۆنراوە . دووەم ـ نیشاندانی باری ئێتیمۆلۆژی . سێیەم ـ لە کام دیالێکت یان بەشە دیالێکتدا بەکاردێنرێ . چوارەم ـ لێکدانەوەی مانای : ١ـ وشە هاوواتاکانی ؛ ٢ـ شەرح و لێکدانەوەی مانای ؛ ٣ـ نموونە هێنانەوە لە ئەدەب و فۆلکلۆر و نووسەری فەرهەنگەکەوە بۆ : أ) ئاسانکردنی تێگەیشتن لە مانای ؛ ب) شارەزابوون لە چۆنێتیی بەکارهێنانی ؛ جـ) بەڵگەی بوونی لە زمانی کوردیدا ... ناوەناوەش بۆ پتر ڕوونکردنەوەی مانای وشەیێک ، کەڵک لە وشەی دژواتا وەرگیراوە ... لە کۆتاییشدا پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و ئیدیۆم ـ ئەمانیش بۆ مەبەستی : ١ـ ڕوونکردنەوەی پتری مانای وشەکە ؛ ٢ـ بەیانی مەودای بەکارهێنانی وشەکە ؛ ٣ـ نیشاندانی مانای جۆربەجۆری ؛ ٤ـ خستنە ڕووی زێدە زانیاری لەبارەیەوە .

وشە هاوبێژ ( Homonym )ەکان ـ واتە ئەوانەی بە خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ـ

بە یەك وشە دانەنراون و جیاکراونەتەوە و سەرلەنوێ وەك وشەی سەربەخۆ بە خەتی ڕەش نووسراونەتەوە و ژمارەیان بۆ دانراوە ، بەو شێوەیەی لە خوارەوە دەیبینین :

ئاز[1] - سەخت ، تووش ...

ئاز[2] - ساخ ، ساغ ...

ئاز[3] - ئازا ...

ئاز[4] - ئەو ...

ئاز[5] تەماعکار ، چاوبرسی ...

ئاز[6] - زیپکەی شیری ...

ئاز[7] - هێز ...

ئاز[8] - نەوە ، وەچە ...

وشە فرەواتا (Polysemantic)کان - واتە ئەو وشانەی مانایان زۆرە و ئەو مانایانەش لە یەکەوە نیزیکن — واتاکانیان بە ژمارە جیاکراونەتەوە . بەمەش سنوور لە نێوان ماناکانی یەك وشەدا دانراوە و بەکارهێنانی فەرهەنگەکە ئاسانکراوە . بەوێنە :

ئاران[1]

١ ــ زستانەوار ، گەرمەسێر ، قشلاخ . جێ ژیانی کۆچەر لە زستاندا ؛ بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران

٢ ــ لەوەڕگا ، لەوەڕگە ، بژوێن ، زەمەند ، چیمەن ، مێرگ ، گیاجاڕ ، پاوان . زەویی پڕ گیا و لەوەڕ

٣ــ دەشت ، تەختان ، تەختانی ، تەختایی . زەویی

بیٚگرد و تەپۆلکە ٤ ـ گۆشتەزەوی ، نەرمان . زەویی بیٚبەرد و نەرمەنیشک و ساز و لەبار ، کە بۆ کشتوکاڵ دەستبدات ٥ ـ چۆڵ ، بیابان ، دەشتودەر ، سارا ، هەردە .

ئەگەر وشە فرەواتاکە ، ویٚڕای مانای ڕاستەوخۆ واتای ناڕاستەوخۆ (تیان)یشی هەبیٚ ، ئەوە مانا ناڕاستەوخۆکە بەدوا ڕاستەوخۆکاندا دانراوە .

**ئارداویژ**

١ـ ئەو شویٚنەی بەرداش ئاردی لیٚوە دەخاتە قوڵکە ئاشەوە ... ٢ـ ئەو شویٚنەی ئاردی لە لیٚواری بەرداشەوە تیٚدەڕژیٚ ٣ـ مت : ا) دەموگفت ، دەمودوو ، دەموپل ، دەموکاویژ . بریتی‌یە لە دەواری ( بواری ) دەمی قسەکەر ـ واتە شیٚوە و تەرزی قسەکردن و ئاخاوتنی ب) قسەی پڕوپووچ ، وتەی بیٚسەروبەر .

وشە هاوواتا ( Synonym )ەکان ـ واتە ئەو وشانەی یەک مانا دەبەخشن ، یاخود مانایان لیٚکەوە نزیکە ـ مانای وشەی یەکەمیان ( بەگویٚرەی زنجیرەی ئەلفوبیٚی کوردی ) ، یان هەرە باو و ناسراویان لیٚکدراوەتەوە و لە بەردەم ئەوانی دیدا نووسراوە ( بڕوانە : فلآنە وشە ) . ئەگەر جیاوازییەکیش لە نیٚوان واتایاندا هەبیٚت ، پەنجەی بۆ ڕاکیٚشراوە ، وەک :

**ئاژاڵدار**

( ئن . نس . : ئاژاڵ + دار )

**ئاژەڵدار**

خاوەنی ئاژەڵ ، خاوەنی پاتاڵ ، خاوەنی وڵسات ...
بە کەسێك یان لایەنییێك دەوترێ خاوەنی مەڕ و مالأت بێ .

**ئاژەڵدار**

( بـ : ئاژاڵدار )

**ئاردماڵ**

( بـ : ئاردماڵك )

**ئاردماڵك**

( ن . نس . : ئارد + ماڵ ((ماڵین)) + ك )

**ئاردماڵ**

تۆپەڵە پەڕۆییێکە ئاشەوان جێ ئاردی پێ دەماڵێ و خاوێن دەکاتەوە .

## نیشانەی مەبەستە زمانەوانییەکان

( ئ . ) - ئامراز

( ئب . ) - ئامرازی بانگهێشتن

( ئپ . ) - ئامرازی پێوەندی

( ئپر . ) - ئامرازی پرسیار

( ئس . ) - ئامرازی سەرسوڕمان

( ئسب . ) - ئامرازی سەرسووڕمان و بانگهێشتن

( ئست . ) - ئاوێستایی

( ئف . ) - ئیزافە

( ئك . ) - ئاوەڵکردار

( ئکت . ) - ئاوەڵکرداری تەئکیدی

( ئکچ . ) - ئاوەڵکرداری چۆنێتی

( ئکچد . ) - ئاوەڵکرداری چەندێتی

( ئکش . ) - ئاوەڵکرداری شوێن

( ئکشج . ) - ئاوەڵکرداری شێوە یان جۆری جێبەجێبوون .

( ئکف . ) - ئاوەڵکرداری نەفی

( ئکك . ) - ئاوەڵکرداری کات

( ئکهم . ) - ئاوەڵکرداری هۆ و مەبەست

( ئن . ) - ئاوەڵناو

( ئنب . ) - ئاوەڵناوی بەرکار

( ئنج . ) - ئاوەڵناوی چۆنێتی

( ئنك . ) - ئاوەڵناوی کارا

( ئنن . ) - ئاوەڵناوی نیسبی

( ئنند . ) - ئاوەڵناوی نادیار

( ئی . ) - ئینگلیزی

( ب . ) - بڕوانە

( بن . ) - بۆ نموونە

( پ . ) - پەند

( پا . ) - پاشگر

( پب . ) - پاشبەند

( پن . ) - پێشبەند

( پە . ) - پەهلەوی

( پێ . ) - پێشگر

( ت . ) - تورکی

( تا . ) - تاك

( تب . ) - تێبینی

( تك . ) - تورکی - کوردی

( تێ . ) - تێپەڕ

( تێن . ) - تێنەپەڕ

( ج . ) - جێناو

( جا . ) - جافی

( جپ . ) - جێناوی پرسیار

( جچ . ) - جێناوی چەندێتی

( جخ . ) - جێناوی خۆیی

( جش . ) - جێناوی نیشانه

( جف . ) - جێناوی نەفی

( جکج . ) - جێناوی کەسیی جودا

( جکل . ) - جێناوی کەسیی لکاو

( جھ . ) - جێناوی هەیی

( چ . ) - چاوگ

( د . ) - دملکی

( دو . ) - دەستەواژە

( ڕ . ) - ڕەنگ

( ڕس . ) - ڕووسی

( ڕك . ) - ڕەگی کردار

( ز . ) - زازایی

( ژ . ) - ژمارە

( ژب . ) - ژمارەی بنجی

( ژد . ) - ژمارەی دابەش

( ژك . ) - ژمارەی کەرتی

( س . ) - سادە

( سس . ) - سانسکریتی

( سل . ) - سلێمانی

( سن . ) - سنەیی

( شن . ) - شنۆیی

( ع . ) - عەرەبی

( عك . ) ـ عەرەبی ـ کوردی

( ف . ) ـ فارسی

( فر . ) ـ فەرەنسی

( فك . ) ـ فارسی ـ کوردی

( فل . ) ـ فەیلی

( فن . ) ـ فارسی کۆن

( ق . ) ـ قەد

( قك . ) ـ قەدی کردار

( ك . ) ـ کوردی

( كئ . ) ـ کوردستانی ئێران

( كب . ) ـ کارا بزر

( كت . ) ـ کوردی ـ تورکی

( كخ . ) ـ کرمانجیی خواروو

( كر . ) ـ کردار

( كژ . ) ـ کرمانجیی ژووروو

( كع . ) ـ کوردی ـ عەرەبی

( كف . ) ـ کوردی ـ فارسی

( كك . ) ـ کەرکووکی

( كۆ . ) ـ کۆ

( كی . ) ـ کۆیی

( كید . ) ـ کرداری یاریدەدەر

( ل . ) ـ لەك و لوڕ

( لن . ) ـ لاتینی

( م . ) ـ موکریانی

( مت . ) ـ مانای تیان ( مجاز )

( مڕ . ) ـ مانای ڕاستەوخۆ

( ن . ) ـ ناو

( نب . ) ـ ناوی بەرکار

( نت . ) ـ ناوی تایبەتی

( نچ . ) ـ ناوی چاوگ

( ند . ) ـ ناوی دەنگ

( نر . ) ناوی نێر

( نس . ) ـ ناسادە

( نش . ) ـ نیشانە

( نك . ) ـ ناوی کارا

( نگ . ) ـ ناوی گشتی

( نڵ . ) ـ ناوی کۆمەڵ

( نم . ) ـ ناوی مادی

( نو . ) ـ ناوی واتا

( نێ . ) ـ ناوی مێ

( و . ) ـ وشە

( ونب . ) ـ وشەی نوێباو

( وز . ) ـ وشەی زڕەێژ

( وم . ) ـ وشەی مردە

( هـ . ) ـ هەورامی

( هر . ) ـ هەولێری

( ین ٠ ) ـ یۆنانی

◇ ئیدیۆم

(( )) دەقی وەرگیراو

× دژواتا

// هاوبێژ

- هاوواتا

* بۆ لێك جوداكردنەوەی دوو نیوەی بەیتێك

## نیشانەی نموونە ئەدەبییەکان

١- ( ئاسک )

شێرکۆ بێکەس ، ئاسک ( شانۆگەرییەکی شیعرییە لە پێنج تابلۆدا ) ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٢- ( ئاگرین )

عەبدوڵڵا عەزیز خالد ، شوان (چیرۆک) ، هەولێر ، ١٩٨٤ .

٣- ( ئەحمەد موختار )

دیوانی ئەحمەد موختار جاف ( بە کۆششی ئەفراسیاب ئەحمەد موختار جاف لە چاپدراوە ، ئامادەکردن و لێکدانەوە و پێشەکی بۆ نووسینی پرۆفیسۆر دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٤- ( ئەخۆڵ )

ئەخۆڵ ، پەیمان و شیوەن ، سلێمانی ، ١٩٧٠ .

٥- ( ئەدەب )

دیوانی ئەدەب ، چاپی سێیەم چاپخانەی هەولێر ، هەولێر ، ١٩٦٦ .

٦- ( ئەسیری )

دیوانی ئەسیری ( مستەفا عەسکەری کۆیکردۆتەوە و لە سەری نووسیوە ) ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

٧- ( ئەفسانە )

یەشار کەماڵ ، ئەفسانەی چیای ئاگری ( شوکور مستەفا کردوویە بە کوردی ) ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٨- ( ئەنوەر )

ئەنوەر قادر محەمەد ، زریان ( شیعر ) ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٩- ( ئیحسان )

د . ئیحسان فوئاد ، گوڵی کێوی ( شیعر ) ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

١٠- ( بابان )

جەمال بابان ، سەید کەڵەك و هەشت چیرۆکی کۆمەڵایەتیی کوردی و تابلۆیێك (چیرۆك) ، بەغدا ، ١٩٦٩.

١١- ( باپیر )

عەلی کەمال باپیر ، دیاریی شارەزوور ( شیعر ) ، سلێمانی ، ١٩٦٦ .

١٢- ( باڵندەکان )

یەشار کەمال ، باڵندەکانیش کۆچیان کرد ( ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل لە تورکییەوە کردوویەتی بە کوردی ) ، بەغدا ، ١٩٨٨ .

١٣- ( بەختیار )

دیوانی بەختیار زێوەر ، کۆکردنەوەی : مەحموود زێوەر ، بەغدا ، ١٩٨٩ .

١٤- ( بەرەو لوتکە )

عەبدوڵڵا سەراج ، هەڵکشان بەرەو لوتکە ( ڕۆمان ) ، بەغدا ، ١٩٨٩ .

١٥- ( بەیتی دمدم )

بەیتی دمدم ، ئامادەکردنی عەبدولحەمیدی حوسەینی ، ١٩٨١ .

١٦- ( بۆتانی )

کاکە مەمی بۆتانی ، بازنە ( چیرۆک ) ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

١٧- ( بیمار )

عەبدولڕەزاق بیمار ، کانیلە و خۆشەویستی ( هەڵبەست ) ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

١٨- ( بێخود )

دیوانی بێخود ، ( کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەر نووسینی : محەمەدی مەلا کەریم ) ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

١٩- ( بێسارانی )

دیوانی بێسارانی ، ( کۆکردنەوە و لێکدانەوە : کیومرث نیکرفتار ) ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ .

٢٠- ( بێکەس )

دیوانی بێکەس ، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکیخستووە و سەرەتای بۆ نووسیوە و سەرپەرشتیی لەچاپدانی کردووە . چاپی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٢١- ( بێگەرد )

ڕەئووف بێگەرد ، بوار ( کورتە چیرۆک ) ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٢٢- ( پاشا )

خوسرەو جاف ، پاشایان کوشت ( ڕۆمان ) ، بەغدا ، ١٩٩٣ .

٢٣- ( پاڵەوان )

فس‌فس پاڵەوان ، وەرگێڕانی : سەعید یەحیا ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

٢٤- ( پەشێو )

عەبدوڵلاّ پەشێو ، شەو نی‌یە خەونتان پێوە نەبینم ، ( شیعر ) ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٢٥- ( پیرەمێرد )

محەمەد ڕەسووڵ هاوار ، پیرەمێردی نەمر ، بەغدا ، ١٩٧٠ .

٢٦- ( پێنجوینی )

محەمەد ئەمین پێنجوینی ، گریژەنە ( شیعر ) ، بەغدا ، ١٩٩٠ .

٢٧- تایەر بەگ )

دیوانی طاهیر بەگ ، بەغدا ،

٢٨- ( تەنەکە )

یەشار کەمال ، تەنەکە ( شوکور مستەفا لە تورکییەوە وەری‌گێڕاوە ، بەغدا ، ١٩٨١ .

٢٩- ( تحفە )

ئۆسکارمان ، تحفەء مظفریە ، ب ١ و ٢ ، بەرلین ، ١٩٠٥ ، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر ڕێنووسی کوردی : هێمن موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ؛ بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٣٠- ( جەفایی )

دیوانی جەفایی ، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٣١- ( جەلالی )

عەمەری جەلالی ( داستان ) ، ئامادەکردنی جاسمێ جەلیل ؛ د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ خستوویێتە سەر کوردی نووسینی تیپی عەرەبی و فەرهەنگی بۆ کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٢ .

٣٢- (جزیری )

دیوانا مەلایێ جزیری ، تویژاندنا صادق بەهائەدین ئامێدی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٣٣- ( چاچانی )

کارلینێ چاچانی ، شێر و کەو ( شیعر ) ، پەریڤان ، ١٩٦١ .

٣٤- ( چریکە )

چریکەی خەج و سیامەند ، عوبەیدوڵلا ئەیوبیان کۆیکردووەتەوە ، سەروەت محەمەد ئەمین لە ڕێنووسی لاتینییەوە هێناویەتیە سەر ڕێنووسی ئێستای کوردی ، سلێمانی ، ١٩٧٨ .

٣٥- ( خانای قوبادی )

خانای قوبادی ، شیرین و خوسرەو ( محەمەدی مەلا کەریم ساغیکردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ ڕێك خستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە ) ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٣٦- ( خانی )

ئەحمــەدی خــانی ، مــەم و زیــن ، ئەســتەموولْ ، م ـ بۆزئەرسەلان لە چاپی‌داوە .

٣٧ـ ( خەندەلێو )

ڤیکتۆر هیگۆ ، خەندەلێو ( ڕۆمان ) ، ڕەئووفی ئەحمەد ئـالانی لـە عەرەبییـەوە کردوویـە بـە کـوردی ، بـەغدا ، ١٩٨٠ .

٣٨ـ ( خدر )

خدر سلێمان ، گوندیاتی ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

٣٩ـ ( خدر و خەلیل )

خـدری سلێمان و خـەلیلی جندی ، ئێزدیـاتی ، بـەغدا ، ١٩٧٩ .

٤٠ـ ( خواجە )

ئەحمــەد خواجــە ، چیــم دی ، بــەرگی یەکــەم ، بەشــی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٦٨ .

٤١ـ ( دایك )

مەکسیم گۆرکی ، دایك ( ڕۆمان ) ، کەریمی حیسامی لـە فارسییەوە کردوویە بە کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٤٢ـ ( دمدم )

عەرەب شەمۆ ، قەلاّی دمدم ( داستان ) ، شوکور مستەفا کردوویە بە کرمانجیی خواروو ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٤٣ـ ( دیلان )

دیلان ( شیعر ، بەغدا ، ١٩٦٩ .

٤٤ـ ( ڕەئووف )

ڕەئـووف حەسـەن ، سـبەینێ بـاوکت دێتـەوە ( کورتـە چیرۆک ) ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

٤٥- ( ڕووبار )

شێرکۆ بێکەس ، ڕووبـار ( چیرۆکـە شـیعر ) ، بـەغدا ، ١٩٨٤ .

٤٦- ( زارگۆتن )

ئۆردیخانی جەلیل و جەلیلی جەلیل ، زارگۆتنا کوردا ، لە پیتی لاتینییەوە وەسەر کـوردی ـ عـەرەبی خستن و فەرهـەنگۆك بـۆ ڕێکخسـتنی : شـوکور مسـتەفا و عەبدولەتیف گلی ، بەغدا ، ١٩٩١ .

٤٧- ( زامدار )

مـەحموود زامـدار ، بۆنـی هـەلاڵان دێ ( گۆرانیـی فۆلکلۆری کوردی ) ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٤٨- ( ژانی گەل )

ئیبراهیم ئەحمەد ، ژانـی گـەل ( ڕۆمـان ) ، سـلێمانی ، ١٩٧٢ .

٤٩- ( ژوان )

محەمەد حەمە باقی ، ژوان (شیعر) ، سلێمانی ، ١٩٨٠ .

٥٠- ( ژیر )

کامیل ژیر ، جوانی ( شیعر ) ، سلێمانی ، ١٩٨٣ .

٥١- ( سالم )

دیوانی سالم ، چاپی دووەم ، چاپخانـەی کوردسـتان ، هەولێر ، ١٩٧٢ .

٥٢- ( سەججادی )

عەلائەدین سەججادی ، کوردەواری ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

٥٣- ( سەلام )

دیوانی سەلام ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

٥٤- ( سەی وەهاب )

چەپکێ لە هۆنراوەکانی سەی وەهاب کاکەیی ( هەردەوێڵ کاکەیی ئامادەی کردووە و پێشەکی بۆ نووسیوە ) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٥٥- ( ستران )

ئۆردیخانێ جەلیل ، سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ ( شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد هێناویانەتە سەر رێنووسی کوردیی ئەمڕۆ و فەرهەنگیان بۆ کردووە ) ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٥٦- ( سیابەند )

سیابەندۆڤ سەمەند ، سیابەند و خەجێ ( شوکور مستەفا لە رێنووسی سلاڤییەوە خستوویەتیە سەر رێنووسی کوردی و فەرهەنگۆکی بۆ کردووە ) ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٥٧- ( شار )

حسێن عارف ، شار ( رۆمان ) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٥٨- ( شاکیر ) شاکیر فەتتاح ، ئافرەتی کورد ، بەغدا ، ١٩٥٨ .

٥٩- ( شەرفنامە )

شەرەفنامەی شەرەفخانی بدلیسی ( هەژار کردوویە بە کوردی ) ، بەغدا ، ١٩٧٢ .
٦٠- ( شکۆ )
شکۆیی حەسەن ، قالچیچەك ( شیعر ) ، یەریڤان ، ١٩٦١ .
٦١- ( شێخانی )
سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی ، فۆلکلۆری کوردی ، بەغدا ، ١٩٨٥ .
٦٢- ( شێخ ڕەزا )
شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، کۆکەرەوە و چاپکەری : عەلی تاڵەبانی ، بەغدا ، ١٩٤٦ .
٦٣- ( شێخ نووری )
دیوانی شێخ نووریی شێخ ساڵح ، ئازاد عەبدولواحید کۆی کردووەتەوە و ساغیکردووەتەوە و لەسەری نووسیوە ، بەرگی یەکەم ، بەشی دووەم ، بەغدا ، ١٩٨٢ .
٦٤- ( صەیدی )
دیوانی صەیدی ، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی : محەمەد ئەمین کاردۆخی ، سلێمانی ، ١٩٧١ .
٦٥- ( عێل بەگی )
پێشبینییەکانی عێل بەگی جاف ( کۆکردنەوە و شیکردنەوەی : صدیق بۆرەکەیی ((صفی زادە)) ) ، ١٣٦٠ .
٦٦- ( فەللاح )

کاکەی فەللاح ، ( شیعر ) ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٦٧- ( فۆلکلۆر )

فۆلکلـۆری هۆنراوەکـانی کـوردەواری ، کۆکردنـەوە محەمەد کەریم شەریف ، کەرکووک ، ١٩٧٤ .

٦٨- ( قانع )

دیوانـی قـانع ، بورهـان قـانع کۆیکردۆتـەوە و چاپی کردووە ، سلێمانی ، ١٩٧٩ .

٦٩- ( قەرەداغی )

حەسیب قەرەداغی ، فەرهـەنگی خـەم (( ٣ )) ، بـەغدا ، ١٩٨٩ .

٧٠- ( قەفتان )

د. کـاوس قـەفتان ، پێنـج تـابلۆی شـێواو و چـەند چیرۆکێکی تر ( چیرۆك ) ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

٧١- ( قزلجی )

حەسەنی قزلجی ، پێکەنینی گەدا ، بەغدا ، ١٩٧٢ .

٧٢- ( قوباد )

قوبادی جەلی زادە ، تەمتومان (شیعر) ، بەغدا ، ١٩٩٠ .

٧٣- ( کامەران )

دیاری ( شیعر ) ، سلێمانی .

٧٤- ( کوردۆ )

کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی ، پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ لە زاری کوردەکانی سۆڤێتەوە تۆماری کردووە .

شوکور مستەفا و ئەنوەر قادر هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

٧٥- ( کەشکۆڵ )

کەشکۆڵی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ( کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی ) ، بەرگی چوارەم ، بەغدا ، ١٩٩٣ .

٧٦- ( کوردی )

دیوانی کوردی ، چاپی سێیەم ، چاپخانەی کوردستان ، هەولێر ، ١٩٧٣ .

٧٧- ( کوێخا سێوێ )

عەزیزی مەلای ڕەش ، کوێخا سێوێ (ڕۆمان) ، هەولێر ، ١٩٨٦ .

٧٨- ( کۆردەرە )

خوسرەو جاف ، کۆردەرە ( ڕۆمان ) ، بەغدا ، ١٩٨٩ .

٧٩- ( کۆیی )

دیوانی حاجی قادری کۆیی ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا ، پێداچوونەوەی مەسعوود محەمەد ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٨٠- ( گەرمیان )

هەڵبژاردەیەک لە هۆنراوەی فۆلکلۆری کوردی ناوچەی گەرمیان ، هەردەوێڵ کاکەیی کۆیکردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

٨١- ( گۆران )

سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ، دیوانی گۆران ، محەمەدی مەلا کەریم کۆیکردووەتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

٨٢- ( گێلەپیاو )

عەزیز نەسین ، گێلەپیاو ، وەرگێڕ : عەبدوڵلا حەسەن زادە ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

٨٣- ( لە خەوما )

جەمیل صائب ، لە خەوما ، پێشکەش کرد ن و لێکۆڵینەوەی جەمال بابان ، بەغدا ، ١٩٧٥ .

٨٤- ( لەیلێ و مەجنوون )

لەیلێ و مەجنوون ، دەباغیان ساڵی ١٣٥٩ی کۆچی لە نووسینەوەی بووەتەوە . کاردۆخی خستوویەتیە سەر ڕێنووسی نوێی کوردی . لێکۆڵینەوە و پشکنینی محەمەد ئەمین هەورامانی ، بەغدا ، ١٩٨٥ .

٨٥- ( مەحوی )

دیوانی مەحوی ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کەریم ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٨٦- ( مەدهۆش )

حەمە عەلی مەدهۆش ، یانەی دڵان ، ١٩٨٢ .

٨٧- ( مەسعوود )

مەسعوود محەمەد ، حاجی قادری کۆیی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

٨٨- ( ( مەلا وەسمان )

مەلا وەسمان ، دیوانی مەلا وەسمان ، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی : د . ئەمین موتاپچی ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

٨٩- ( مەلای گەورە )

مومتاز حەیدەری ، مەلای گەورە ، مەلا محەمەدی کۆیی ، هەولێر ، ١٩٧٥ .

٩٠- ( مەم[١] )

محەمەد مەولوود (مەم) ، چیرۆکەکانی مەم ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

٩١- ( مەم[٢] )

محەمەد مەولوود (مەم) ، پایزە خەون ، بەغدا ، ١٩٨٧ .

٩٢- ( مەمێ ئالان )

مەمێ ئالان ، چیرۆکنڤیس کۆیکردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە ، صالح عەلی گوللی و ئەنوەر قادر محەمەد لە ڕێنووسی لاتینییەوە هێناویانەتە سەر ڕێنووسی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

٩٣- ( مەولەوی )

دیوانی مەولەوی ( کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە و لەسەر نووسینی : مەلا عەبدولکەریم مودەڕڕس ) ، بەغدا ، ١٩٦١ .

٩٤- ( محەمەد )

محەمەد نووری تۆفیق ، نالەی درەخت ، ( کورتە چیرۆک ) ، بەغدا ، ١٩٨٦ .

٩٥- ( مستەفا )

ڕەشپۆشێکی جیهانی چوارەم (کورتە چیرۆک) ، بەغدا ، ١٩٨٤ .

٩٦- ( موحەڕەم )

موحەڕەم محەمەد ئەمین ، مام هۆمەر ( چیرۆک ) ، هەولێر ، ١٩٥٤ .

٩٧- ( مینە جاف )

دیوانی مینە جاف ، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی ، مستەفا نەریمان ؛ پێشەکی د. حەسەن جاف ، بەغدا ، ١٩٩٠ .

٩٨- ( میهری )

دیوانی میهری ، بژاردن و ئامادەکردنی : عەزیز گەردی ، سلێمانی ، ١٩٧٧ .

٩٩- ( نالی )

دیوانی نالی ، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی : مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

١٠٠- ( وەفایی )

دیوانی وەفایی ، لێکۆڵینەوەی : محەمەد عەلی قەرەداغی ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

١٠١- ( وەلیی دێوانە )

ژیان و بەسەرهات و هۆنراوەی وەلیی دێوانە ، عوسمان هەورامی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

١٠٢ـ ( ویژدان )

ئەحمەد موختار جاف ، مەسەلەی ویژدان ( چیرۆکی کوردی‌یە ) ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، پێشەکی و لێکۆڵینەوەی : د. ئیحسان فوئاد .

١٠٣ـ ( هەتاو )

عەلی ئەشرەف دەروێشیان ، هەتاو ( وەرگێڕانی عەبدوڵڵا حەسەن زادە ، ١٩٩٠ .

١٠٤ـ ( هەردی )

ئەحمەد هەردی ، ڕازی تەنیایی (شیعر) ، چاپی دووەم ، سلێمانی ١٩٨٤ .

١٠٥ـ ( هەڵمەت )

لەتیف هەڵمەت ، پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە ، سلێمانی ، ١٩٧٧ .

١٠٦ـ ( هەمەوەند )

کۆمەڵە شیعری فەقێ قادری هەمەوەند ( مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم کۆیان کردووەتەوە و ڕاستیان کردووەتەوە و فەرهەنگۆکیان بۆ ئامادەکردووە ، بەغدا ، ١٩٨٠ .

١٠٧ـ ( هێمن )

تاریك و ڕوون ، گوڵبژێرێك لە شیعرەکانی هێمن ، بەغدا ، ١٩٧٤ .

١٠٨ـ ( هیچ )

خوسرەو جاف ، هیچ ( ڕۆمان ) ، بەغدا ، ١٩٩١ .

ئ

دەنگێکی کۆنسۆنانتی تەوژمۆکی دواوەی زمانە . لە زمانی کوردیدا ( ئـ ) فۆنێم نییە ، بەڵکو دەنگێکی یاریدەدەرە و لە سەرەتای ئەو وشانەوە ، یاخود ئەو بڕگانەوە پەیدا دەبێ ، کە بە بزوێن دەست پێ دەکەن . سەرەڕای ئەوەی تێچوونی ( ئـ ) لە وشەی لێکدراوی کوردی ، وەك : (( گوڵ + ئاو - گوڵاو : ماست + ئاو - ماستاو : زەرد + ئاو - زەرداو : سەر + ئێش + ە - سەریەشە ... )) و بوونی ( ئـ ) بە بزوێن لەو وشانەدا کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون ، وەك : ((دائم ـ دایم : دائرة ـ دایەرە : بئر ـ بیر ... )) و بەکارنەهێنانی لە ناوەڕاست و کۆتایی ( لە زمانی کوردیدا ((ئـ)) لە کۆتایی وشەدا تەنیا لە وشەی (( نەء ))دا دەبینرێت ، کە ئەویش بە زۆری دەکرێ بە (( نا )) ) وشەدا ، ئەوە دەسەلمێنن ، لە زمانی کوردیدا ( ئـ ) فۆنێم نەبێ و دەنگێکی یاریدەدەر بێ ، بۆ ئاسانکردنی دەربڕین ... ئەمەش هیچ لەوە ناگۆڕێ ، کە ( ئـ ) لە زمانی عەرەبیدا فۆنێمە .

وێنەی ئەم دەنگە هەمزەی پێدەوترێ . لەنووسینی کوردیدا نیگاری ( ئـ ) بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٩دا پەیدابووە . بەوێنە ، لە ژمارە (١٨)ی گۆڤاری ((ژین))ی ئەستەموولدا ، کە ( ٨ )ی مایسی ١٣٣٥ی لەسەر نووسراوە و دەکاتە (٨)ی مایسی ١٩١٩ ، وتارێکی داوەر ئەردەلانی بە ناوی ((چۆن بکۆشین ؟))ەوە هەیە (ل ١٦) و

لە نووسینی هەندێ وشەدا نیگاری (ئ)ی بەکارهێناوە . بۆ نموونە : (د ٨ ـ ((ئەمرد)) ) ؛ (د ١١ ـ ((ئەم)) ) ؛ (د ١٣ ـ ((ئەمانە)) ) ؛ (د ١٤ ـ ((ئەکۆشین)) ) ...

ئەم هەنگاوەی داوەر ئەردەڵانی کاری کردە سەر هەندێ نووسەری گۆڤاری ((ژین)) . بۆ نموونە یەکسەر لە ژمارەی داهاتوودا ـ واتە لە ژمارە (١٩)دا ، ٢٢ی مایسی ١٣٣٥ك / ١٩١٩ز ـ ع . ڕەحمی ، کە نووسەرێکی چالاکی ئەو گۆڤارە بووە و لە زوربەی ژمارەکانیدا بەرهەمی بڵاوکراوەتەوە و لە هیچ یەکێك لە نووسینەکانی بەر لە ژمارەی (١٩)دا پیتی (ئـ)ی بەکارنەهێناوە ، لەو شیعرەیدا کە بە ناوی ((لوما ژ بلبل))ەوە لە لاپەڕە (١٦)ی ژمارەی ناوبراودا چاپی کردووە ، بۆ نووسینی چەند وشەیێك پیتی (ئـ)ی بەکارهێناوە . هەروەها کەمێ دواتریش لە کتێبی (( هینگر زیمان کوردی )) ( ١٩٢١ )دا نیگاری ( ئـ ) زۆر بەرچاودەکەوێ ... لە کتێبی (( کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی))دا (١٩٢٥) ، (ئ) تا ڕادەیێك بەکارهاتووە ...

ئەو داوەر ئەردەڵانی‌یەی لە ژمارە (١٨)ی گۆڤاری ((ژین))دا ، کە ڕێکەوتی (٨)ی مایسی ١٣٣٥ دەکات ، لە ژمارە (٧)ی گۆڤاری ((کوردستان))یشدا ، کە هەر دیسان لە (٨)ی مایسی ١٣٣٥دا دەرچووە ، وتارێکی بەناوی ((هێشتا نوستووین))ەوە بڵاوکردووەتەوە و لێرەشدا بەهەمان چەشن پیتی ( ئ )ی بەکارهێناوە .

بـەر لـە پـەیدابوونی وێنـەی هـەمزە ، وشـەکانی وەك : (ئەشـکێنێ ، هـەڵئەکوتێتـە ، ئـەکا ... ئـەهێنن ، ئـەیاندا ...) ، (ئـ)یـان تێـدا بـە (ا) دەنووسـرا ، وەك : (اشـکێنێ ، هەڵاکوتێتە ، اکـا ... اهێنـن ، ایـاندا ...) ... بەڵام سـەرنج ڕاکێـش ئەوەیـە ، لـە ژمارە (١٦) و (١٧)ی ڕۆژنامـەی (( تێگەیشـتنی ڕاسـتی ))دا ( ٢٣ی شـوباتی ١٩١٨ ، ل ١ ــ ٢ و ٢٦ی شـوباتی ١٩١٨ ، ل ١ ــ ٢ ) بـە نـاوی (( نطـق عـالمیکی اجتمـاعی کـورەی کـوردان بـو ڕۆسـای عـالی قدر کوردان ))ەوە هەیـە ، کـە ئـەو وشـانەی ناومـان بردن بەو چەشـنەی خـوارەوە نووسـراون تێیـدا : ((اەشکێن ، هل اەکوتیتە ، اەکا ... اەهینن ، اەیاندا ...)) . ئـەم جۆرە نووسینە بـۆ یەکـەم جـار لـە وتـاری نـاوبراودا دەبیـنرێ . هەرچەندە ئەمـە زۆر بڵاونـەبووەوە و پـەرەی نەسـەند ، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا دەتوانـرێ بـە هـەنگاوێك دابنرێ بەرەو پەیدابوونی (ئە) ، بەتایبەتی چونکە بەر لەو وتارە لە هیچ چاپەمەنیی‌یێکی کوردیدا ئـەوە نابینرێ ، کە بە دوا هەمزەدا کورتە بزوێنی ( ە ) نووسرابێ .

ئا[١]

بە پێی ڕێبازی نووسینی کوردی بە ئـەلفوبێی عـەرەبی ، بریتییە لە دوو پیتی (ئـ) و (ا) ، بـەڵام بە ئـەلفوبێی لاتینی بە یەك پیت دەنووسرێ و ( A , a )ی بۆ کراوەتـە نیگـار . نووسینی لاتینـی ، کـە بایـەخی بـە دەنگـی (ئـ) نـەداوە و

تەنیا (ا)ی کردووەتە وێنەی ، لەبەر ئەوەیە ، کە فۆنێمەکە ( ا )یە و هەرچی ( ئـ )ە فۆنێم نییە و دەنگێکە ئەرکی یاریدەدان و ئاسانکردنی دەربڕینی بزوێن دەبینێ ... ( ب . : ئـ ) . (ا) بزوێنی ریزی پێشەوە و بەشی سەرووە - واتە لە کاتی وتنی ئەم فۆنێمەدا ، زمان کە بە شێوەی ئاسۆیی هاتوچۆ دەکات ــ بەرەو پێشەوە دەچێت و لە باری ئەستوونیی جوولانەوەیدا بەرەو سەروو هەڵدەکشێ .

ئا[٢]

( ئـ . ) . بەڵێ ، ئەرێ ، ئارێ ، ئەری ، ئادی ، با ، هەرێ (لە زمانی ئاخاوتندا) لە وەڵامی پرسیارێکدا بە ئەرێتی و پەسەندکردن : ئازاد زوو گەڕایەوە ؟ ئا ... ؛ ئەم کراسەت پێ جوانە ؟ ئا ... (( خۆیشم نازانم چۆن چۆنی هاتە دڵمەوە ؟ ... ئا ... وەك بێتەوە یادم سەرەتامان بە هۆی نووسینەوە رێچکەی بەست ...)) (مستەفا ، ل ١١٧). ((دیارە باسی خۆتت زۆر بیستۆتەوە ؟ ... ئا ، بیستوومەتەوە ...)) (هیچ ، ل ١٠) . (( ــ دایەگیان ئەوە لای باوکمەوە نانت بۆ هێناوین ؟ دایەگیان وتی : ئا بەساقەتان بم ... )) ( موحەڕەم ، ل ١٥ ) . (( ئا باقێ خوە دکن )) (زارگۆتن ، ل ٢٠٦) - واتە - بە ئای باوکی خۆتان دەکەن : بە گوێی باوکی خۆ دەکەن ، بە بابی خۆ دەڵێن (ئا - بەڵێ ) .

(ئـا) دەشـێ دووپـات بکرێتــەوە و بوتــرێ (ئائـا) ، کـە ئەمەش دەبێتە هۆی پتر تەئکیدکردن : (( ... ئا ... ئا ... زانیــم ... زانیــم )) ( ئاســك ، ل ٢٦ ) . (( بــاوکم بــە دارجگەرەکە چەناگەی ئەخوراند و وەڵامی دایەوە : ـ ئـا ... ئا ... هەناسەی داوە ... )) (کۆردەرە ، ل ٤٠) . (( ئا ، ئا ، دەبارێت ، شەو خەوم دیوە خەو )) ( هیـچ ، ل ٧ ) . (( ـ ئائا ... خۆ تۆ ئێمەت دروست نەکردووە ! )) ( بەرەو لوتکە ، ل ٥١ ) . ((ئا ، ئا هەر وەها بکە ...)) ( خەندەلێو ، ل ١١٧ ) ...

ئا[٣]

( ئـ . ) بۆ پتەوکردنی نیشاندان و ئاماژەکردن : ئا لـەم (لەو) شوێنەدا . ئا ئەم (ئەو) پیاوە . ئـا لـەوێ . ئـا بـەم (بەو) جۆرە . ئا ئەوەتە . ئا ئێستا (نها ، فێکا) ... (( ئا لەم ژوورە گەزۆی ئاسمان ئەبارێ * ئا لەم خوارە بە شەو قـەتران دەبارێ )) (ئەسیری ، ل ٦٠)) . ((ئـا لـەو خاکـە پرشنگ رێژیی پرچی زێرینت * ئەی مانگی جوان سەنگین ئەکا نرخی بینینت )) (گۆران ، ل ٢١٨) . ((لە دوای ئا ئەم خۆشەویستییە کوتوپـڕ * کـە هـەڵیان پچڕکـان و کەوتـە سەر ئاگر)) (پیرەمێرد ، ل ٢٣٩) . ((چیای ئاگری هـەڵیان دەلووشـێ ... جـا تووڕەیی‌یەکـەی ئـاگری ئـا ئەمەیـە)) (ئەفسـانە ، ل ١٤١) . ((پەنجـە بچکۆلـەکان بـۆ خـانووە بلاوبووەکانی نـاو دارخورماکـان ڕاکێشا و وتـی : ــ ئـا

لـــەويدايين)) (مســـتەفا ، ل ١٩) . ((ئـــا بـــەم جـــۆرە ... شـانۆگەريى (ئاسـك)تـان دى و ئـا بـەو جـۆرەش كۆتـايى هـات)) (ئاسـك ، ل ٨٩) . (( ئا بەم ڕەنگـە دەبـێ لـەو چيا هەڵديرانە تاكيان نەهێڵين و ئاسەواريان كوێربكەينەوە )) (دمـدم ، ل ٣٠٧) . ((ئا ب ڤى جۆرەيى وانا وەختـێ خوە دبـــهراند)) (كـــوردۆ ، ل ١٣١) . ((... ئـــا ئێســـتا كـــە دانيشتووين ژەندرمە كردى بە ژوورا و هـەمووماني ڕاپێچ كرد ...)) (ژانى گەل ، ل ١١٧) . ((ئا نها ، مەسـەرێ خوە دايە بەر هەڤ ، وەك بزانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٨٧) . ((بەكۆ دبـێ : تـو سـەر سـەرێ مـن و چـەعڤێ مـن هـاتى ، ئـا ڤێكـا نيشانا وێ داينە)) (زارگۆتن ، ل ٧٤) ...

ئا[٤]

( ئـــ . ) بــۆ داخـــوازى و ورياكردنـــەوە و بانگهێشـــتن و هاندان و پرسيار : ئا چۆڕێ ئاوم بۆ بێنە . ئا وەرە ئێرە بزانم چيتە . ئا بزانم چۆن شلكوتـى مـەرگى دەكـەى ... و ((ئايشــێ بـە قەرەواشــى گـوت : ئـا كچــێ هـەڕۆ ئـەو دوو مـافوورەى كە پار دلبـەر دروسـتى كـردن لەسـەر سـتێرێ مـافووران دانـراون بيانهێنـە ...)) (دمـدم ، ل ٢٠٤) . (محـە خوڕىيە يەكێك لە شوانەكانى ، وتـى : ئـا بڕۆ گوريسێكم بۆ بهێنە !)) (هيچ ، ل ٣٠) . ((... ڕووى كردە خێزانى : ئا خێراكـــە چايـــەكم بـــۆ تێكـــە ، بـــا فريـــاى جەماعـــەت و تەراويحەكـەم بكـەوم)) (قزلجـى ، ل ٧٠) . ((ئا فلأنـە كـەس

بانگ‌کەن)) ( لە خەوما ، ل ٤٢) . ((...ئا لاچن بیکەم بە قوربانی گوللەییێك)) (ژانی گەل ، ل ٢٠٢) . ((دلبەر بانگی کرد گوتی : ((ئا ڕاوەستە ، لەبیرم چوو ...)) (دمدم ، ل ٢٨٧) . ((... ئا بزانم ئەمانە بە دوای چی‌دا دەگەڕێن ؟)) (کوردەرە ، ل ١١٥) . ((ئا کابرا ! ئەمەمان بۆ ڕوون بکەرەوە)) ( خەندەلێو ، ل ١٦ ) . (( ... ئا کورە کێ لەوێیە ؟ )) (ویژدان ، ل ٢٩) .

ئا[5]

(ئـ . ) لە باری سەرسوڕمان و گوماندا : ـ ئا ! خۆ کەوتە خوارێ . ـ ئازاد خنکا ! ـ ئا ... (( ـ هەی ... دەستت بشکێ ... هەی : ـ ئەوە چۆن لێت بەربوو ! ...ئا... )) ( مەم[2] ، ل ٣٥ ) . (( من بەش بە حاڵی خۆم دەڵێم ژن مردەیە و شەیتان سواری کۆڵی بووە و ئا...)) ( بەرەو لوتکە ، ل١٣ ) .

بۆ نیشاندانی سەرسوڕمان و گومانی تەواو دەکرێ دووپات بکرێتەوە و بوترێ (ئا ئا) : ئا ... ئا ... خۆ کەوتە خوارێ .

ئا[6]

( ئـ . ) - ئاخ ، ئاه . نکەنکی نەخۆش بۆ دەربڕینی ئێش و ئازار . هانابردنە بەر خەڵك لە کاتی لێقەومان و تەنگ و چەڵەمەدا . دەنگی هەناسەبڕکێ ... : ئا... مردم .

ئا... فریام کەون... ماڵم سووتا . (( ئایەکی خنکاوی کرد و جامی دا بە دەستمەوە ... )) (کوردەرە ، ل٥٢) .

لە تاووتینی پێکانی مەبەستدا دووبارە دەکرێتەوە : ... ئا ... ئا ... مردم ... فریامکەون ... ماڵم سووتا .

ئا[7]

( ئـ . ) . لە پێکهێنانی ئامراز و وشەی وەك ( ئادەی ، ئاخۆ ، ئاوا ، ئاوەها ... )دا هاریکاری دەکا : (( ئادەی کچم ... چایەکمان بۆ لێبنێ )) (شار ، ل٥٩) . (( ئادەی بیخەنە ئەو ژوورەوە ، زۆر چاك ئاگاتان لێ بێ هەتا بانگی ئەکەم لێی ئەپرسمەوە)) ( لە خەوما ، ل ٤٣ )... ( بـ : ئادەی ) . ((لاکین ئاخۆ چ شاعیرێکی تر * شیعرە پیشەی بە دائیمی ، سەرومڕ)) (گۆران ، ل ١٢٢) ... (بـ . : ئاخۆ) . دڵدارەکەی تۆ * ئاوا پەرپووتە )) ( هەڵمەت ، ل ٤٤ ) ... ( بـ : ئاوا) ... (بـ : ئاوەها بوو ) (( ... کارەساتی ئەم هەواڵە ...)) (ئاسك ، ل ٥٣)... (بـ . : ئاوەها) .

ئا[8]

(جش) . (نست) . : هاو : پە . : ئان : سس . : ئینا) . (بـ . : ئەو) .

لە ناوچەی هەورامان و گەرمیان و موکریان ... بە واتای (ئەو) دێت : ((وەختیو ، ئا ، یارە نزیکم مەبۆ * لاوە سەریمەنە ، تێر سەیرم کەرۆ)) (صەیدی ، ل ١٣٠) . ((ئا ڕووە کە دادێ لەیلێ بەردەوە * مەجنوون مەن بە داخ

دووری و دەردەوە)) (لەیلیٚ و مەجنوون ، ل ١٤٢) . ((هەر کەس ئا ئیموٚ بنوٚ وە بوٚوە * مەردەی سەد سالٚ بوٚ زەندە مەبوٚوە)) (گەرمیان ، ل ٧٠) ... (بـ . : ئادتیٚ ، ئادی). ◊ئا خورماویٚ توٚ واردیٚنە پیٚشکەش ئینا کیسە و منەتە - ئەو خورمایەی توٚ خواردووتە دەنکەکەی وا لە گیرفانی مندا . واتە : ئەو فرٖوفیٚڵەی دەیکەیت من لەوسەری دیٚمەوە .

### ئا[9]

لە دیالیٚکتی ژووروری کوردیدا وەك جیٚناوی هەیی بوٚ میٚ بەکاردیٚ و شیٚوەییٚکی جیٚناوی (یا)یە : (( تو پوڕ ئحسان و خوی ڕەحمی * ل دەرویشان ئابی خەشمی )) ( جزیری ، ل ٤٣٤) ... (بـ . : یا) .

### ئا[10]

کورت کراوەی وشەی (ئاغا)یە : ئا خدر ؛ ئا حەسەن ...

### ئاب[1]

( ف . ) ؛ ( ن . )

١ـ ئاو ، ئاڤ (ئست . : ئاپ ؛ فن . : ئاپی ؛ سس . : ئاپە ؛ ف . : آب) . لە ئەدەبی کوردیـدا زوودا ، زوٚر دەبینریٚ : ((سروشکم ئاب و دانەی نارە ، کیٚ دی * بە گەرمی داوەریٚ بەم طەرزە ئەرزە ؟!)) (نالی ، ل ٤٤٨) . ((ئاگر و ئاب و گل دکت * قەلبان ژ قەلبان هل دکت)) (جزیری ، ل ١٨٧) . ~ ئەسرین ((ئاوی ئەسرین و ئاوی

فرمێسك : ((بە ئاب ئەسرین ئەو زیندەواران * بە دوعای خوفیەی طاعەت گوزاران)) (هەمەوەند ، ل ٦١) . ~ تەلاّ - ئاوی زێڕ : ((ئۆسای هونەروەر تەختەی سیم و ساف * مەنەققەش بە ئاب تەلاّ بێ خیلاف)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٣١) . ~ حەیات - ئاوی ژیان (( (نالی) ئوستادەکی گەلێ چا بوو * خضری ئابی حەیاتی مەعنا بوو)) ( کۆیی ، ل ٢١٩ ) . ((ژ عنایەت نەظەریێ ( خاصە ) کو هەر مەصرەع و بەیتەك * قەدەحێن ئابیحەیاتینە د شعرا مە لە بالەب)) (جزیری ، ل ١١٨)... حەیوان - ((ئابی حەیات ، ئاوی ژیان : ((هیجری ئەمڕۆ شەوقی دیداری بەسەردا کەوتووە * تەشنەیی دیداری تۆیە ئابی حەیوانی دەوێ)) (کوردی ، ل ٩٢) . ((زاری تۆ گوڵزارە خۆ ، بۆچ ئابی حەیوانی هەیە؟ * سەروی تۆ ئازادە ، نارنج و ڕوممانی بەردەدا ؟)) (وەفایی ، ل ١٢) . ~ زەلاڵ - ئاوی پاك : ((ئافتابە و لەگەن چە تەلاّی بێ غەش * پڕ ئابی زەلاڵ چون شیری بۆنخۆش)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ٩٨) . ~ زەندەگان : ((ئاگەهـ ب ڕژت ژ ئاسیمانی * سەرچەشمەیێ ئابێ زەندەگانی)) ( خانی ، ل ٢٤٨ ) . ~ ساف : ((پڕ جە ئابی ساف زەلاڵ چەن زەمزەم * ئابش چ ئابێ چون چەشمەی زەمزەم)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٧١) . ~ گەرم - ئاوی گەرم : ((وەر نە تا مەحشەر من وەی دەردەوە * هام وەی ئاب گەرم و ئاهـ و سەردەوە)) (هەمەوەند ، ل ٦٩) .

(ئاب) ئێستا نە لە زمانی ئاخاوتن و نە لە زمانی نووسیندا بەتەنیا بەکارناهێنرێ ، بەڵام لە ڕۆنانی وشەی ئاسادەدا بەشداری دەکات : ئابخانە ، ئابڕوو ، تێزاب .

٢- مت : أ) کاتێ پاشگری (- دار)ی دەخرێتە سەر واتای (بریسکە ، بریقە ، ورشە ، ڕەونەق ) دەگەیەنێ ( بـ . : ئابدار١) : ب) دەمێ وشەی وەك (تاب ، ڕەنگ ...)ی بە دوادا دێ واتای ( ڕازاوە ، ڕەونەق ... ) ڕادەگەیەنێ :

~وتاب (بـ . : ئابوتاب٢) . ~و ڕەنگ : (( بە ئاب و ڕەنگ و ڕوو حۆری ، بە زولف و گاکۆڵی غیلمان * گوڵاویان دا لە مەیخانە ، غوباریان عەنبەر ئاسا کرد)) (وەفایی ، ل ٣٤) .

ئاب[٢]

هەشتەم مانگی ساڵی ڕۆمییە ( ٣١ ڕۆژە ) بە لاتینی (Augustus)ی پێدەوترێ و بە ناوی (ئاوگوست)ی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە ناونراوە ... ئەو لە مانگی ئابدا لە دایك بووە . لە سەرەتای ئابدا دەچنە هاوینەهەوار .

ئابا

( ع : آباء ) ، ( ن . ، کۆ )

باوکان

((نەصیحەت بێ برا ، گەر ڕۆڵە بوو مەڕوانە بۆ ئابا * گەواهی عەدلی ئەم دەعوایە پووری مەڕوانە))

(مەحوی ، ل ٢٧٨) . ((ئابایێ نزام و جەدد و والد * مەنسووب و مسەلسەلێد خالد)) (خانی ، ل ٨٠) .

### ئابات

( م . ) ، ( بـ . : ئاباد[١] ) .

### ئاباد[١]

( ئـ . ) ، ( ئـن ) . لـە موكریانیدا دەنگی (د)ی كۆتایی دەبێتە (ت) و دەوترێ (ئابات) . - ئاوا ، ئاوەدان .

١ـ لە زمانە ئێرانییەكاندا وەك مۆرفیمێكی بەند بە دوا ناوێكدا دێ و یاریدەی پۆنانی ناوێكی نوێ دەدا بۆ ناونانی شار و دێ : ئیسلام ئاباد : جەلال ئاباد .

٢ـ لە زمانی كوردیدا : أ) بە زۆری بە هەمان چەشنی زمانانی خزمی ، خۆی دەنوێنێ ( مەهاباد ...) . (( ڕا جەعفەرئاباد سارای گەرم مەیل * مەنزڵ شیراز شار سەودای عەشق لەیل )) (مەولەوی ، ل ٢٦٠) . (( تا ڕێك نەكەون قەبیلی ئەكراد * هەروا دەبنە خەرابەئاباد )) (كۆیی ، ل ١٩٩) . ((بۆ كیمیایی وەسڵت ، لە كونجی میحنەت ئاباد * سەد وەك ئەسیر و لوقمان بێ نەشئە بوون لە سیماب)) (قانع ، ل ٥٦)... ب) بەتەنیاش لە شێوەی ئاوەڵناوی سادەدا بە كاردەبرێ : ((وەك بەهەشت خەملیوە خاكی كوردستانی ئازاد * موڵكی ئازەربایجانیش بۆ ئەوە مەعموور و ئاباد)) (هێمن ، ل ٩٤)... ( بـ . : ئاوا[١] )

**ئاباد**[٢]

( ع . : ابد ) . ( كس ، ل . ) . (ن . ، ئن .) . (بـ : ئەبەد)

**ئابادانی**

(فـ . : آبادانی) . ( كس . ، ل . ) . ( ن . ، نس ) .

**ئابادی**[١]

( ف . آبادی ) . ( ن . ، نـس ) - ئـاوايی ، ئـاوەدانی ، چادرنشين . (بـ . : ئاوەدانی) . ((ئەی عەجەب (سالم) لـە صـەحرا ڕوو لـە ئابـادی دەكـا * يـاری شـاری موژدەبـێ چۆڵكەری هامون هاتەوە)) (سالم ، ل ١٣٣) . ((يا ڕەب بە ميقـدار ئابـاديی تـەنيا * بـە جـەمع ژی ڕۆح ئـەموات و ئەحيا)) (هەمەوەندی ، ل ٢٣) .

**ئابادی**[٢]

( ع . : ابدی ) . ( كس . ، ل . ) . ( ئن . ، نس . )
( بـ . : ئەبەدی)

**ئابان**

( فـ . : آبان ) . ( كذ . ) . (ن . ، نس ) . هەشتەم مانگی ساڵی هـەتاوی (ئێرانـە) . بەرانبـەر مـانگی (خـەزەڵوەڕ)ی كوردی دەوەستێ - واتـە دووەم مـانگی پـايز ، كـە لـە ٢١ی تشرينی يەكەم تا ٢٠ی تشرينی دووەم دەگرێتەوە .

**ئابجۆ**

( ف . : آبجو ) . ( م . ) . ( ن . ، نس . : ئاب[1] + جۆ ) .
(ب . : ئاوجۆ)

**ئابخانە**

(فك . ) . (ن . ، نس . : ئاب + خانە) . ئاودەست ، ئاودەستخانە ، ئابدەست ، ئابدەستخانە ، ئەدەبخانە ، دەستاو ، دەستاڤ ، پێشاو ، سەراو ، کەناراو ، ئاڤڕێژ ، چێشمە ... شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن .

**ئابدار[1]**

( فك . ) . ( ئن . ، نس . : ئاب + دار ) ١ـ شوێنێك یان شتێك ، کە ئاوی زۆربێ . (( یەك سەد هەزار مەن ئەناری ئابدار * سێ سەد هەزار مەن جە سێبی خونسار )) (لەیلیٚ و مەجنوون ، ل ٩٨) . ( ب . : ئاودار ، ئابدار ) . ٢ـ مت . : بریسکەدار ، بریقەدار ، بە ڕەونەق ، بە جەوهەر . (( یەمی دیدە پڕ لە مەرجان ، وەك یەشمی ئابدارە * شەبەیە شەبیهی زوڵفی سیاهی وەك زوخاڵی)) (نالی ، ل٦٥٩) . ((دا نە کەمەر گاش شەمشیر ئابدار * دوو نیم بی خەطەر بە وێنەی خەیار)) (هەمەوەندی ، ل ٣٥٥) .

**ئابدار[2]**

( فك . ) . ( ن . ، نس . : ئاب[1] + دار ) . قاوەچی و چایچیی گەورە ماڵان . ((دەهاتە کن ئەولادی شا ڕۆستەم بەگان ، سێ ساڵان دەبووە سەققا و سێیان دەبوو بە ئابدارە)) (تحفە ، ب ٢ ، ل ١٩٤) .

**ئابدارباشی**

(کت . ) . (ن . ، نس . : ئاب + دار + باشی ((ت . : سەرەك ، سەرۆك)) ) . سەرۆکی چاپەز و قاوەچیی دیوەخان .

**ئابدارخانە**

( فك . ) . ( کئ . ) . (ن . ، نس . : ئاب + دار + خانە) .
١- ژووری چالێنان و قاوەسازکردن بۆ دیوەخان . ٢- بار و بنەی تایبەتیی پیاوی گەورە لە سەفەردا (( بار و بنەی شایان هانی و لە گۆڕایی دەوری کانی خێوەت و خەرگا هەڵدرا و بار و ئابدارخانە خرا و بارەگای کۆڕی خۆنکاری لە لای سەرووی سەرچاوەوە بەرپاکرا و دەس کرا بە بەزم و ئاهەنگ ...)) (شەرەفنامە ، ل ٦٣٨) .

**ئابدۆزەك**

( کئ . ) . ( ن . ، نس . : ئاب[١] + دۆز - دز + ەك ) .
١- شرینقە ، فیچقە . دەرزی کە دەرمان و تراوی پێ لە لەش دەکەن . ٢- لوولە شووشەی دەم تەنگ ، کە دەرمانی پێ لە چاو و لووت و گوێ دەکرێ .

**ئابدەست**

(فك .) . (ن . ، نس . : ئاب[١] + دەست) . (بـ . : ئابخانە) .

**ئابدەستخانە**

(فك .) . (ن . ، نس . : ئاب[١] + دەست + خانە) . (بـ . : ئابخانە) .

**ئابراغ**

- ئاپراخ ، ئاپرەخ ، ئەپرەخ ، یاپراخ ، یاپراغ . (بـ . : یاپراخ) . ((هەر مالەك دێ تەبلی‌یەکە گراریێ یان ئابراغا و سەربڕێ لسەر دانێت و نێنتە بەر قولێ)) (خدر ، ل ١٩) .

**ئابڕوو**

( فك . ) . ( ن . ، نس . : ئاب[١] + ڕوو ) . ١ـ ئاڤڕوو : ئاوڕوو : ئاوی ڕوو : سووری و جوانیی ڕوو : گەشە و ورشە و ڕەونەقی دەموچاو ... ئەم وشەیە لە کوردیدا بەم مانا ڕاستەوخۆیەی بەکارناهێنرێ و تەنیا بە واتا ناڕاستەوخۆکەی لە کاردایە : ٢ـ مت . : شەرم : شوورەیی : ناموس : حەیا : حورمەت : شەرەف : ڕووسپێتی : ڕووسووری : سەربڵندی ... (( ڕۆژی (رومیل)یش بەو شەڕە شکا * ئابڕووی فاشستی نێچگاری تکا )) ( پیرەمێرد ، ل ٣٣١ ) . (( بەکر شەیتانە ، ئابڕووی خوشکی من دەبا)) (تحفە ، ل ٣١٨) . (( ئەوەی پووکاندبوویەوە ، ئەوەی بەو دەردەی بردبوو ، شتهایەك هەبوون لەو کارەدا کە پەڵەی ئاوێتبا سەر شەرەف و ئابڕووی ، بەڵام چی بوو ؟ بۆ خۆشی نەیدەزانی )) (ئەفسانە ، ل ٨١) . ((واتش خاس ئابڕووم پەرێم ئاوەردی * حەیا و ناموسم چە عالەم بەردی)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٤٠) ... ؟ بە ~ : بەشەرم : بەناموس : بەحەیا : بەحورمەت : ئابڕوودار ... (( کوا

بەخشەندەی وەك حەتە ؟ كوانێ جوانی بەئابڕوو ))
(بەیتی دمدم ، ل ۱۱)) . بێ ~: بێشەرم : بێناموس :
بێحەیا : بێحورمەت : بێچاوڕوو : چەرداوە ڕوو ...

## ئابڕووبران

( چ .، ئین . ( كب . ، نس . : ئابڕوو + بـ (( ڕەگی ڕانەبوردووی (بردن) )) + ر ((پاشگر)) + ان ((كۆتایی)) ) .
حەیابران : ناوزڕان : ڕووڕەش بوون : بێڕێزبوون : سووك بوونی كەسێك بێ ئەوەی بكەری كارەكە دیار بێ .

## ئابڕووبراو

(نب . : ئنب . : نس . : ئابڕوو + بـ (( بردن )) + ر ((پاشگری كارا بزری)) + ا ((نیشانەی كاتی ڕابوردوو)) + و ( پاشگر ) . حەیابراو : ناموس براو : ڕیسواكراو : سووككراو ... كەسێك سووك و ڕیسوا و سەرشۆڕی ناو كۆمەڵ كرابێ .

## ئابڕووبردن

( چ. ، تێ . ، نس . : ئابڕوو + بردن ) . ناموس بردن : ناموس شكاندن : حەیابردن : شەرەف بردن : شەرەف شكاندن : بێشەرەف كردن : ناوزڕاندن : ڕووڕەش كردن : ڕیسواكردن : سووككردن : ئەتك كردن : بەدناوكردن ... سووك و چرووك كردن و بێحورمەت كردنی كەسێك (( قیبلەكەم بەو زاری هەر وەك غونچە بۆیە

پێکەنی * دا بڵێن خەندەی لە گوڵ دێ ئابڕووی پەروین دەبا )) (وەفایی ، ل ٣ ) . (( تۆ نەمردووی ئاخ دڵت مرد * زێـڕ ئـابڕووی دڵداریـی بـرد )) ( کامـەران ، ل ٥١ ) . (( ناموس و حەیا و ئابڕووم بەردی * پەی چێش پێ کارە نمە بی ڕازی )) ( لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٩٣ ) .

### ئابڕووبەر

( نك . ، ئنك . ، نس . : ئابڕوو + بـ (( بردن )) + ەر ) . حەیابەر ؛ ناموس‌بەر : مایەی ریسوابوون ... ١ـ یەکێك ببێتە هۆی حەیابردن و شەرەف‌شکاندنی کەسێك (( ... شێرکۆ بە بێ ڕامان و سێ‌ودوو لێکردن ڕای‌کردە کابرای بێ ئابڕووی ئابڕووبەر و ئەو نێزەی لە دەست دەرێنا کە گەفی لە ژنەکە دەکرد ... )) ( شەرەفنامە ، ل ١٢٧ ) . ٢ـ کار و کردەوەیێك ، کە ببێتە مایەی سووك بوون و عەیبە هێنانە سەر : (ڕۆڵە ! تەمەڵی کارێکی ئابڕووبەر)ە .

### ئابڕووبەرە

(نك . ، ئنك . ، نس . : ئابڕوو + بـ ((بردن)) + ەر + ە) . ئابڕووڕێژ ؛ حەیابەرە ، ناموس‌بەرە ... (بـ . : ئابڕووبەر) .

### ئابڕووتکان

(چ . ؛ تێن . ، نس . : ئابڕوو + تکان )

( بـ . : ئـابڕووچوون ) . (( فـەن و فێڵـت کەوتـە ڕوو ئەی چەرخ لە لام ئابڕووت تکـا * بۆیـە بـەرزت کردمـەوە

بم خـــەیت و ئـــازارم بگـــا )) ( پـــیرەمێرد ، ل ٢٩٠ ) . (( لاوێکی نامەردم تووش هات لە ڕێما بە سوێن و پەیمان * وەك ڕەشمـــار پەیکـــەری خـــوارد ، نوســـت لـــەناو جێمـــا : ئـابڕوومی تکـان )) ( گـۆران ، ل ٢١٠ ) . (( لـە جامبـازیدا بووەتە شای وەستایان و ئابڕووی تکاوە )) ( قەفتان ، ل ١٢٣ ) . (( ئای کە نەنگە ئای کە ئابڕووتکانە * کە گەورەیە ئەنجام ئەم تاوانە )) ( دیلان ، ل ١٤٧ ) .

ئابڕووتکاندن

( چ . ، تێ . ، نس . : ئابڕوو + تکان + انـدن ) ( بـ . : ئـابڕووبردن ) . (( بـە ئاشـكرا دەسـتی لەگـەڵ دەسـتی حوسـەی خـدر گـاوانی جیرانمـان تێکـەڵ کـرد . ئـابڕووی تکاندین . لـە لای عارەب و عەجەم بە سـۆدرەی بردیـن )) ( کوێخا سێوێ ، ل ١٧٢ ) .

ئابڕووتکاو

(ئنب . ، نب ، نس . : ئابڕوو + تك ((تکان)) + ا + و) . ئـابڕووچوو : حـەیاچوو : نـاوزڕاو : پایـەنزم ... کەسـێك حەیا و ناموسی چووبێ و تووشی سووکی و سەرشۆڕی بووبێ .

(( لەگەڵ ئەوەش دەستی چەپەڵ ،
ئابڕووتکاو ،
هەر خەریکە ، تەکەڵ تەکەڵ

بۆ ئاسمانی پڕ لە هەتاو
تەپە دووکەڵ هەڵئەسێنیٚ ،
گڕی سپی ئەخنکێنیٚ ! ... )) ( گۆران ، ل ٣٢٨ ) .

ئابڕووچوون

( چ . ، تێن . ، نس . : ئابڕوو + چوون ) . ئابڕووتکان : ئابڕووڕژان : حەیاچوون : ناموسچوون : ڕیسوابوون : سووکبوون : بەدناوبوون : ناوزڕان : حورمەت و حەیا نەمان ... سووکبوون و نەمانی ڕێز و حورمەت لە نێو خەڵك و کۆمەڵدا . (( ... منیش چارەم نەبوو ، دەمەویست سەرپۆشێك بۆ ئابڕووچوونەکەم پەیدا بکەم )) (گێلەپیاو ، ل ١٠٩) . ((... ئەوانە لە شەڕدا ئابڕوویان دەچیٚ و دوژمن زوو زەفەریان پیٚ دەبا)) (دمدم ، ل ٧٢) . (( ـ کوڕە قسەی چا بکە ئابڕوومان دەچیٚ)) (قزلجی ، ل٣٦) . ((کچەکان هەرسێك ڕووت بوون . پاڵیان وێكدا ، ڕۆیشتن ، گوتیان : ئۆوەی ئابڕوومان چوو ، هیچمان بە خۆماندا نەداوە)) (تحفە ، ب ٢ ، ل ٩٣) . ... ◊ ئابڕووی چوو ـ ڕیسوا بوو : ڕیسوا و سەرشۆڕی ناو کۆمەڵ بوو .

ئابڕوودار

(نن . ، نس . : ئابڕوو + دار) . ئابڕوومەند : بەئابڕوو : بەشەرم : بەناموس : بەحەیا ، بەحورمەت : بەڕێز ... بە یەکێك دەوتریٚ حەیا و حورمەتی هەبیٚ ، واتە ـ کەسی خاوەن شەرەف و ناموس .

**ئابڕوودارانە**

(بـ . : ئابڕوومەندانە)

**ئابڕووداری**

(بـ . : ئابڕوومەندی)

**ئابڕووڕژان**

(بـ . : ئابڕووچوون)

**ئابڕووڕێژ**

(نك . ، ئنك . ، نس . : ئابڕوو + ڕێژ ((ڕێژان)) ) . (بـ . : ئابڕووبـەر ؛ ئابڕووبـەرە) . ((ئـابڕووڕێژە ویصـالی یـار و خوێنڕێژە فیراق * عالەمی عیشق و مەحەببەت هەر بڕێژە ، هەربڕێژ)) (مەحوی ، ل ١٤٣) .

**ئابڕووفرۆش**

( نك . ، ئنك . ، نس . : ئابڕوو + فرۆش ((فرۆشتن)) ) . حـەیافرۆش ؛ نـامووس فـرۆش ... بــە کەسـێك دەوتـرێ حەیا و نامووسی خۆی بفرۆشێ . × ئابڕووکڕ .

**ئابڕووکڕ**

(نـك . ، ئنـك . ، نـس . : ئـابڕوو + کـڕ ((کڕیـن)) ) . حەیاکڕ ؛ نامووس کڕ ... یەکێك حەیا و نامووسی خەڵکی بکڕێ . (( (پـیرۆز ) ... بیری‌کەوتـەوە کـە چـۆن لـە پێنـاو ژیـانێکی سـەربەرزانە و بەڕێزانـەدا ، ڕەنـج ئـەدا و پـەل

ئەکوتیٚ تا نانێکی مەمرە و مەژی دەستئەکەویٚ . کە چۆن خۆی نافرۆشیٚ بە ئابڕووکڕان و چۆن ناوچەوان بڵندیی خۆی ناگۆڕێتەوە بە سایە و مایە و پایەی دەوڵەمەندان )) (شاکیر ، ل ۳۰) . × ئابڕووفرۆش .

ئابڕووڵیٚهەڵگیران

(چ . ، تێن . ، نس . : ئابڕوو + لیٚ + هەڵ + گیران) . ئابڕوونەمان : حەیاڵیٚهەڵگیران ... (( دەڵیٚ : مەتڵەبت چییە ؟ دەڵیٚ : قوربان ، ئابڕووم لیٚهەڵگیراوە )) ( تحفە ، ب ۲ ، ل ۸۳) .

ئابڕوومەند

(ن . ، ئن . ، نس . : ئابڕوو + مەند) . (ب . : ئابڕوودار) . (( لە ئەو سەردەمانەشدا چەندان ئابڕوومەند ڕاخزیون )) ( خەندەلێو ، ل ٥۲ ) . (( ئەستەموولٚ گەورەیە ، پان و بەرینە ... شوێنی خواناسانە ... مەڵبەندی ئابڕوومەندانە )) ( باڵندەکان ، ل ۷٥) .

ئابڕوومەندانە

( ئن . ، نس . : ئابڕوو + مەند + انە ) . ئابڕوودارانە : شەرەفمەندانە ... (( هەرچی دەبیٚ بلاٚ ببیٚ . لەگەڵ ناسیە زەماوەند دەکەم . پێنج شەش منداڵمان دەبیٚ . ژیانێکی ئابڕوومەندانە پێکدێنین )) ( گێلەپیاو ، ل ۱٤۱ ) .

**ئابڕوومەندی**

( نچ . ، نس . : ئابڕوو + مەند + ی ) . ئابڕووداری : بە حورمەتی : بەڕێزی ... کەسێ خاوەنی ناموس و شەرەفمەندی بێ .

**ئابشار**

( ف . : آبشار ) . ( ن . ، نس . : ئاب[1] + شار) . ( بـ . : ئاوشار ) .

((ڕاییێل و تار و پۆپی کولووی بەفرە ، ئابشار * با بای دەدات و ماسیی دێ وەکوو مەکووك)) (نالی ، ل ٢٥٩) .

((گریە بە خوڕ دێتە خوار ، هەروەکو عەینی بەهار * خۆش بووەتە ئابشار مەدمەعی سەرشانی من)) ( نالی ، ل ٣٣٤ ) .

((بێ مەحەبا ئاو دەڕێژێ گەه بە فەوز و گەه بە دەور * چاوی من مودێکە شێوەی ئابشاری گرتووە)) ( نالی ، ل ٥٤٢ ) .

**ئابلۆقە**

(ت . : abluka ) . (ن) . گەمارۆ : چواردەورە . ( بـ . : ئابلۆقەدان ) . ~ ئابووری : ~ ڕامیاری ...

**ئابلۆقەدان**

( چ . ، تێ ، نس . : ئابلۆقە + دان ) . ١ــ گەمارۆدان : چواردەورگرتن : چواردەوریلێگرتن : دەوردان : دەورگرتن ،

بەگیرهێنان ... ٢ـ گەلەکۆمەکێ لێکردن : هێرش بردنە سەر ناحەز و دوژمن ... ((لە ژوورەکەی سەرۆکی شارەوانی دەچوونە پێش ! باڵیان دەکرد بە باڵی یەکتردا ، تاوەکو ژوورەکەیان ئابلۆقەدا)) ( مەم[١] ، ل ٩٢) . (( ... هێرشێکی گەورەی کردە سەر قەڵای (کوسجەد) ، حوسێنی کوڕی مەنصوری لە قەڵاکەدا ئابلۆقەدا ، لەو ئابلۆقەدانەدا زستانێکی زۆر تووش و سەخت بەسەردا هات و کەس لەبەر بەند و بەستەڵەک لە دەرەوە خۆی نەگرت )) (شەرەفنامە ، ل ٥١) .

ئابلۆقەدەر

(نك . ، نس . : ئابلۆقە + د ((دان)) + ەر) . گەمارۆدەر : چواردەورگر : دەورەدەر : دەوردەر : دەورگر : بەگیرهێن ... بە کەسانێك دەوترێ چواردەوری شوێنێکیان گرتبێ و خەڵکیان بەگیرهێنابێ : ((لەپڕ و نەکاو لەشکرێك لە کوردەکانی (جوزقان) بەسەر ئابلۆقەدەرانیاندا دا و دەرەتانیان بۆ نەهێشتن)) (شەرەفنامە ، ل ٥١ ـ ٥٢) .

ئابلۆقەدران

(چ . ، تێن . / کب . : نس . : ئابلۆقە + بـ ((دان)) + ر + ان) . گەمارۆدران : چواردەورگیران : چواردەوەرلێگیران : دەوردران : دەورەدران : دەورگیران : بەگیرهێنران ... ( بـ . : ئابلووقەدان ) . (( چەند مانگێك بوو ئەو خەڵکە

زۆر و زەوەند بە ژن و منداڵ و پیر و جوانەوە حەسار و ئابلۆقەدرابوون )) (دمدم ، ل ٣٤١) .

ئابلۆقەدراو

( نك . ، ئنب . ، نس . : ئابلۆقە + د (( دان )) + ر + ا + و ) . گەمارۆدراو : چواردەورگیراو : چواردەورلێگیراو : دەوردراو : دەورەدراو : دەورگیراو : بەگیرهێنراو ... شوێنێك یاخود كەسێك چواردەوری گیرابێ .

ئابلووقە

(بـ . : ئابلۆقە)

ئابلووقەدان

(بـ . : ئابلۆقەدان)

(( ... ئابلووقەی شارەكە دەدا )) (مەسعوود ، ل ٣٧٠) .

ئابلووقەدران

(بـ . : ئابلۆقەدران)

ئابلووقەدراو

(بـ . : ئابلۆقەدراو)

ئابلووقەدەر

(بـ . : ئابلۆقەدەر)

((زیرەكیی مەلا كارێكی وای كرد ئابلووقەدەران دوور كەوتنەوە ...)) (هیچ ، ل ٦٢) .

**ئابنووس**

( یـن . ؛ ن . ) . لـە وشـەی ( ebenos )ی گریکی‌یـەوە وەرگـیراوە ، کـە واتـای ( داری ڕەش ) دەگـەیـەنێ .
// ئابەنووس ؛ ئاوەنووس ؛ ئەبەنووس ؛ عەبەنووس ... ١ـ درەختێکـە دارەکـەی زۆر قـورس و ڕەقـە و تەختەکـەی ڕەش و بریقەدارە : (( ئەمجا ئەی یار ، ئەی خوا ؟ـ ژنی عەشقم ، ئەی ڤینووس * ئەی هەیکەلی بـەدەن لـە عاج ، توالێـت ئـابنووس)) ( گـۆران ) . ((بونیـانی کیـبر و سەرکەشیشـە طـاقی کیسـرەوی * دانـانی ظـولم و ڕووڕەشییە تەختی ئابنووس)) (نالی ، ل ٢٣٨)... ٢ـ مت . : بە واتای (ڕەشی) بەکاردەبرێ : ((عاجز مەبە هەرگیز لـە چـەپی چـەرخی ئـابنووس * گشـتی بـە دەسـتی فـەردە مقامات و چارەنووس)) (قانع ، ل ١٠١) .

**ئابوتاب**

(نك .) . (ن . ، نس . : ئاب[١] ((ئاو ؛ تەڕایی ؛ فێنکی)) + و + تاب ((تاو ، گەرمی)) ) . ١ـ ئاووتاو : ((گەر ئابوتـابی جەنـەتی یـو دۆزەخیـت دەوێ * بنـوارە نێـو چـەوانی بەشـووش و بـرۆی عـەبووس)) (نـالی ، ل ٢٤٠) . ((دیـدە عـەینی جارییـە ، دڵ پـڕ لـە نـاری مووقـەدە * ئابوتـابی حوسن ئەدەم بەو گوڵ عوذاری موو قەدە)) ( مەحوی ، ل ٢٧٢ ) ... ٢ـ مـت . : ڕازاوە ، ڕەونـەق : (( دلبـەر ... بـۆ

جوانی پەردەی گوڵداری بە ئابوتابیشی بە نێو ڕەشماڵدا گێڕابوو )) (دمدم ، ل ١١٨) . ( بـ . : ئاب[١] : ئاووتاو) .

**ئابوهەوا**

(ن . ، نس . : ئاب[١] (ف . ) ((ئاو)) + و + هەوا ((ع . : هواء)) ) . ( بـ . : ئاووهەوا) . ((کام ئابوهەوا ؟ موعتەدیلی نەشئو نومابێ * یەعنی لە وەسەط کانییە گەرمێکی تێ زابێ)) (نالی ، ل ٦١١) .

**ئابۆری**

(کژ .) : ( ن ) .

( بـ . : ئابووری[١] )

**ئاپۆنە**

کەتە : تەژە : زەبەلاح : زلحۆ : زلحۆرت : لەندەهۆر ... زەلامی کەتە و زەبەلاح . مرۆی تەژی ناقۆلا . ( بـ . : زلحۆرت ) .

**ئابوور[١]**

(کژ .) . (ن .) . ١ـ کەرەستە و پێویستیی ژیان : مایەی گوزەران و بژیو : وەسیلەی هەبوون ... ~ دەست خستن : پەیداکردنی پێویستیی ژیان . ◊ بە ~: ا) کارامە : ب) دەست پێوەگر (بۆ ماڵ و سامان) . بێ ~: بێدەرامەت . ٢ـ ڕێگای ژیان .

**ئابوور** [٢]

( کـــژ . ) . ( ن . ) . ڕێکوپێـــک ؛ ســـاز ؛ تەکـــووز ؛ ئامادە ... ~ کرن : ڕێکخستن ؛ پێکهێنان ؛ سازدان ؛ تەکووزکردن ؛ ئامادەکردن : مە کارا خۆ ئابوورکر : ئێمە کاری خۆمان سازکرد .

**ئابوور** [٣]

(کژ .) . (ن . ) . ١ـ ڕێـز ؛ حەیا ؛ حورمەت ؛ نامووس ؛ شەرم ؛ ئابڕوو ... ~ کرن : شەرم کـردن . ◊ بـێ ~ : بێشەرم ؛ بێحەیا ... ٢ـ پاکی ؛ داوێن پاکی .

**ئابووری** [١]

( کژ . ، کنح ) . (ونب . ) ( ن . ، نس . : ئابوور + ی ) .
١ـــ ژیـان ؛ هـەبوون ؛ ژیـن و ژیـان ؛ حـاڵ و مـاڵ . ٢ـــ پاشـەکەوتی مـاڵداری ؛ پێکـهاتنی مـاڵداری ؛ ژیـانی مـاڵداریی کۆمـەڵ و بەرهـەمی و دابـەش بوونـی ... بـەم مانایـــەی دووەمـــی لـــە کرمـــانجیی خـــواروودا زۆر بڵاوبووەتەوە و ڕەگی داکوتاوە : (( ئەو ڕووداوە ناخۆشە زۆر کاری کردە سەر هەستی ناسک و شاعیرانەی مـن و هـەروەها زۆریشـی تەئسیر کردە سـەر وەزعـی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سیاسی کوردەواری )) (هێمن ، ل ٣٦) . ((ئـەگینا ... لێشـاوی سـواڵکەر ... ڕوو لـە وڵاتەکەمان دەکا و گیروگرفتێکی تازەش دەبێتە سەرباری

ئابووری و بازرگانی شەق و شڕی ئێمە)) (گێلەپیاو ، ل ١٣٩) .

**ئابووری[٢]**

( کژ . ) . ( ن ) . ڕێکوپێکی : ئامادەیی ( ب . : ئامادەیی) .

**ئابووری[٣]**

( کژ . ) ( ن ) . ١ـ شەرمنی : بەڕێزی : بەحورمەتی ...
٢ـ پاکێتی : داوێن‌پاکێتی .

**ئابووری‌زان**

(نک . ، ئنک . ، نس . : ئابووری + زان ((زانین)) ) .
کەسێ لە ئابووری بزانێ ـ واتە لە ژیانی ماڵداریی کۆمەڵ و بەرهەمی و دابەش‌بوونیدا شارەزابێت .

**ئابووری‌زانی**

(نچ . ، نس . : ئابووری + زان ((زانین)) + ی) .
شارەزایی لە ئابووریدا ـ واتە شارەزایی لە ژیانی ماڵداریی کۆمەڵ و بەرهەمی و دابەش‌بوونیدا .

**ئابووری‌ناس**

(نک . ، نس . : ئابووری + ناس ((ناسین ) . زانای ئابووری ـ واتە کەسێ لە ژیانی ماڵداریی کۆمەڵ و بەرهەمی و دابەش‌بوونیدا پسپۆڕ بێ .

**ئابووری ناسی**

(نچ . ، نس . : ئابووری + ناس ((ناسین)) ) + ی) . زانستی ئابووری ـ واته ئەو زانستەی لە ژیانی ماڵداریی کۆمەڵ و بەرهەمی و دابەش‌بوونی دەدوێ .

**ئابوونه**

(فر . : abonne) . (ف . : آبونمان : ابونه .. ت . : abona : abonman ) . (ن) . ئەو پارەیەی بۆ مافی بەشداری‌کردن دەدرێ . جا بۆ بەردەوامیی وەرگرتنی رۆژنامە و گۆڤار ... بی ، یان مانگانە و ساڵانەی ئەندامێتیی کۆمەڵە و یانە و رێکخراو و پارت ... بێ .

**ئابەنووس**

(پ . : ئابنووس)

(( بوستانی دولبەرم بە نەزاکەت لە چینی زولف * وەك گوێی عاجە بۆ خەمی چاوگانی ئابەنووس )) ( سالم ، ل ٧٣ ) . ((کە هاتە چەرخە و بازی تەشی بە رانی نووسی * دەکەوتە پیابووسی دوو زولفی ئابەنووسی)) (وەفایی ، ل ١٩٤) .

**ئابی**

(ف . : آبی) . نس . : ئاب + ی) . واتای ( ئاوی : شینی کاڵ : تەڕ )ی کوردی دەگەیەنێ ... وێڕای ئەو مانایانە ، لە ئەدەبی کوردیدا بەو دوو مانایەی خوارەوەش دەبینرێ :

١. وەك بەی (بەهیٚ) :

((مەشرەبی (نالی) گەلیٚ ئابی[1]یو ترشە بەلیٚ * موعتەریفە خۆی دەلیٚ : چا نییە ئەطواری من)) (نالی ، ل ٣٩٠) .

٢. ناوی گوڵە

(( (ئابی) و (ئاوداری) و (نیلوفەر)ی زەرد * حاشیەی دەوری وەك خالی بیٚگەرد)) (پیرەمیٚرد ، ل ١٤٣) .

**ئاپ**

(کڕ .) . (ن) . مام : هاپ : برای باوك : برا باڤە . ((ژ ویٚ ڕۆژا ئەبو زیٚد چوو مالا ئاپیٚ خوە ...)) (کوردۆ ، ل ٧١) . ((ئیرۆ ڕۆژا میٚرایە ، ئەزیٚ تەعمینەکیٚ ل وە بکم ، تەعمینا ئاپیٚ خوە مەشکیٚنن)) (ستران ، ل ٦٣) . ((مەمیٚ گازیٚ ئاپ کرییە * ل بەر ئاپ سەکنییە)) (زارگۆتن ، ل ٦٨) . پـ . : خال خازرا ڕاکر ، برازا ئاپ وندا کر (کوردۆ ، ل ٢٣١) .

**ئاپارتی**

(ف . : آپاردی) . ( ل . ) . ( ئن ) .

( بـ . : فیٚلباز ) .

**ئاپەشکەرا**

---

(١) لەم شیعرەی (نالی)دا ، (ئابی) مانای (نەسەلمێن : ڕەفن)یش دەدات . بەپێی ئەم لێکدانەوەیە (ئابی) ناوی کارایە و لە (اباء)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە .

(کس . ) . (ئن . ) . (بـ . : ئاشکرا)

**ئاپەشکەرایی**

(کس . ) . (ن . ) . (بـ . : ئاشکرایی) .

**ئاپراخ**

(کـژ .) . (ن . ) . ئـابراغ : ئـاپرەخ : ئـەپرەخ : یـاپراخ : یاپراغ (بـ . : یاپراخ)

**ئاپرەخ**

(کـژ .) . (ن . ) . ئـابراغ : ئـاپرەخ : ئـەپرەخ : یـاپراخ : یاپراغ (بـ . : یاپراخ) .

**ئاپرێل**

(کس . ) . (ن . ) . (بـ . : نیسان)

**ئاپك**

(ز . ) . (ن . ، نـس . : ئـاپ + ك) . مامۆکــە . بچــووك کراوەی ناوی مامە (بـ . : ئاپ) .

**ئاپنجی**

(ت . : yapanca) . (کس .) . (ن .) پاڵتۆی درێژی فش و فۆڵـی زووی تورکـەکان : یـاخود مشـەمای درێـژی فـش و فۆڵ .

**ئاپۆ**

(کژ.) . (ن.) - هاپۆ

١ـ ( بـ . : ئاپ ) . ٢ـ بۆ بانگکردنی مام ، واته ( ئاپ ) له دۆخی بانگهێشتندا : مەمێ گۆت : (( ئاپۆ مەلا ڤابه ل سەرێ خوەدیان و کوڕانه * کەرەما ته ل سەر سەرێ من و هەر دوو چاڤانه)) (مەمێ ئالان ، ل ٧٠) . ئەحمەد گۆت : ((ئاپۆ ، کا ڤیزا ته ؟ ئەو ل ڤرا نینه ؟)) ( کوردۆ ، ل ١٧٠ ).

((... گۆ : ئاپۆ ، تو ئەختیاری ، تو وەره سوارێ ، ئه تو بڤینه هەڤال ب ڕێوینگییه)) (زارگۆتن ، ل ٦٨) .

**ئاپۆر** [١]

(بـ . : ئاپۆره[١] )

**ئاپۆر** [٢]

(بـ . : ئاپۆره[٢])

**ئاپۆر** [٣]

بیانی ؛ بێگانه ؛ غەواره ؛ غەریب ؛ نەناس ... ( بـ . : بیانی ) .

**ئاپۆرا** [١]

(بـ . : ئاپۆره[١] ) .

((ئاپۆرای خەڵکی دەقیقه به دەقیقه زیاتر دەبوو ...)) (گێلەپیاو ، ل ١١٦) . ((خانجان ... له نێو ئاپۆراکەدا وێستا بوو ...)) (هەتاو ، ل ٧٩) .

**ئاپۆرا[2]**

(ب . : ئاپۆرە[2] )

**ئاپۆرە[1]**

(م .) . (ن . ، نس . : ئا + پۆر + ە) . ئاپۆر[1] : ئاپۆرا[1] : ئاپوورا[1] : قەرەباڵغی : کۆمەڵە خەڵك : کۆبوونەوەی خەڵك پێکەوە : کۆمەڵ و جەماوەری خەڵك کە دەوریان لە شتێك دابێ ... ((حەشامات و ئاپۆرەی زۆر لە بۆرە پیاگ بەربوونە خاپوورکردنی شار)) (شەرەفنامە ، ل ١٥٩) . ((ماڵی شا ئەویٚ ڕۆژیش لە ڕۆژانی پێشوو گەڵێ ئاپۆرەتر بوو...)) (دمدم ، ل ٢٣٨) . ((پاشا ئەویٚ ڕۆژێ زیافەت و میواندارییێکی زۆر گەورە و گرانی بۆ بەگەکان سازدا . دیوەخان زۆر ئاپۆرە و قەڵەباڵغ بوو...)) ( ئەفسانە ، ل ١٣٤ ) .

**ئاپۆرە[2]**

(م .) . (ن ، نس . : ئا + پۆر + ە) . ئاپۆر[2] : ئاپۆرا[2] : ئاپوورا[2] : بەلاَ : نەگبەتی : مەینەتی : سەختەتی : تەنگانە : نەهامەتی : تەنگ و چەڵەمە : تەگەرە و تووشی : کۆسپ و تەگەرە : بەسەرهاتی ناخۆش و خراپ ...

**ئاپۆرەدان**

( چ . ، تێ . ، نس . : ئاپۆرە + دان ) . دەورەدان : دەوردان : کۆبوونەوە لە دەوری شتێك : (( دووسەد

سیٚ‌سەد کریٚکار و وەستا دەستیان لە کار هەڵگرتبوو ، وەك میٚشەنگوین لە دەوری حیسابدارەکە ئاپۆرەیان دابوو )) (گیٚلەپیاو ، ل ٤١) . ((لەو کەین و بەینەدا ژن و منداڵی ئاوەدانی ئاپۆرەیان لە دەوری من دابوو)) (هیٚمن ، ل ٣٥) .

### ئاپووره [١]

(ب . : ئاپۆره[١])

### ئاپووره [٢]

(ب : ئاپۆره[٢])

### ئاتاج

(ع . : احتیاج) . (ن . ، ئن .) . هەژار : ژار : بیٚچاره : داماو : نەدار ، بەلەنگاز : فەقیر : کلۆڵ : خاکسار : خاکەسەر : موحتاج ... کەسی دەستکورت و بیٚ‌دەرامەت و بیٚ‌چاره ، کە پیٚویستی بە کۆمەك بیٚ . ( ب . موحتاج ) . ~ی نانیٚکە - موحتاجی نانیٚکە ... ◊ خوا ئاتاج و موحتاجی دەرکی نامەردت نەکا .

### ئاتاجی

(عك .) . (ن . ، نس . : ئاتاج + ی) . ١- هەژاری : ژاری : داماوی : نەداری : بەلەنگازی : فەقیری : دەستکورتی : ئیحتیاج : ئیحتیاجی : موحتاجی : ئەوجیٚ ... ٢- پیٚویستی : پیٚداویستی ..

**ئاتار**

جڕوجـام : شڕوشـیتاڵ : خرتوپـرت ... (( بـەم قسـە بەنرخانەی تۆ ، ئەوانە هەموو لە بن و بۆتکەی هەڵتەکان و ئاتاریـان لـە سـەر پاتاریـان نـەما )) ( کوێخـا سـێوێ ، ل ١٢٢ ) .

**ئاتاژ**

(بـ . : ئاتاج) . (( داپیرە زەینۆ کورد بوایە ، تورک بوایە ، هـەر کەسـێ بوایـە ، ئاتـاژی یـاری و کۆمـەگ بوایـە یـاری دەدان و کۆمەگی دەکردن)) (تەنەکە ، ل ١٠٩) .

**ئاتاش**

(ت .) ، (کـس .) . یـەکناو : هـەناو : دوو کـەس کـە خاوەنی یەك ناو بن ... ((عەمرێ ئاتاشا دانە قوماندارا * بۆ گوڕینا تۆپا و شەڕانارا)) (زارگۆتن ، ل٧٦) .

**ئاتە[١]**

ئا نەوەتە (بـ . : ئا[٢]) .((ژ سێ ڕۆژان ب شووندا ، میڤان ژی دبـە خوەدیـێ مـالا نـە * ئاتـە سـێ ڕۆژ تـمـام بوونـە چارانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٨٧) .

**ئاتە[٢]**

کورتکراوەی ناوی ( ئافتاو )ە . ئاتە خان .

**ئاتەر**

(نست . : ئاتەر ؛ په . : ئاتەرش) . (ب . : ئاگر)

**ئاتەران**

هاتەران ؛ وڕێنە ؛ ڕاوە ؛ ڕاوان ؛ قسەپەڕاندن ... (ب . : وڕێنە ) .

**ئاتەش**

(کف .) . (ن .) . (نست . : ئاتەر ؛ په . : ئاتەرش) . (ب . : ئاگر) . ((گوڵزاری دەر و دەشتن و غیلمان بەهەشتن * ئاهوو صەف و ، ئاتەش بە کەف و ، تیز نیگاهن)) (نالی ، ل ٣٤٢) . ((شەمعا وصاڵی هەر گەشە * شەوقا شەماڵ ئاتەشە)) (جزیری ، ل ٦٣) . ((هەر چوار عەناصیر باوەر بە حیساب * جە خاك و جە باد ، جە ئاتەش و ئاب)) (هەمەوەند ، ل ١٦٧) .

**ئاتەشئەفشان**

(ب . : ئاگرپرژێن) .
((عەصای مووسایە سەر نێزەی لە ڕەغمی مشتی فیرعەونی * بە بەرقی ئاتەشئەفشان و شکڵی ئەژدەها پەیدا)) (سالم ، ل ١٩) .

**ئاتەشەك**

(ن . ، نس . : ئاتەش + ەك) . ئاتشەك : فەرەنگی : سووزەنەك ؛ سفلس ... نەخۆشییێکی گرانە ، برینی

پیس و بەئازار لە ئەندامی زاووزێی نێر و مێ پەیدا دەکا ... ئەم نەخۆشییە کە لە زۆر زماندا بە (سفلس) ناسراوە ، دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (Siphilus)ی گریکی ، کە واتای ( بەراز ـ sys و هاوڕێ ـ phiolos ) - ( هاوڕێی بەراز ) دەدات . ئەم ناوەش نیشانەی چەپەڵی و چڵکنی نەخۆشییەکە دەگەیەنێ .

## ئاتەشباز

(فک .) . ( ن . ، نس . : ئاتەش + باز + ی ) . ( بـ . : ئاگرباز ) .

## ئاتەشبازی

( فک . ) . ( ن . ، نس : ئاتەش + باز + ی ) . ( بـ . : ئاگربازی ) . ◊ ئاتەشبازی بە گونگی خاڵی ناکرێ .

## ئاتەشپارە

( فک . ) . ( م .) . (ن . ، ئن . ، نس . : ئاتەش + پار ((پارچە ، بەش ، کەرت ، کەت)) + ە) . ١ـ پارچەی ئاگر ... ئەسکڵ : پۆڵوو : پەرەنگ : پشکۆ : پەنگر : سکڵ : پەل ... مت . : ١ـ بزۆز : بزێو : بێ ئارام : ناڕەحەت : هاروهاج : دانەسەکناو : بێئۆقرە : ئۆقرەنەگر ... ( بۆ منداڵ ) : منداڵەکەیان چ ئاتەشپارەیێکە ٢ـ دڕ : شەڕانی : شەڕاشو : جینگن ... مرۆی شەڕخواز ٣ـ زرنگ : زیرەك : وریا : بەکار : لێهاتوو : چاپووك : پەیت ، ئازا ... ( بـ . ئاگرپارە ) .

**ئاتەشپەرەس**

( کژ . ) . ( نك . ، نس . : ئاتەش + پەرەس ) . ( بـ . : ئاتەشپەرست ) . ((طۆرم ب دل و پەیرەوی موسایم ئەز * ئاتەشپەرەس و نوریٚ تەجەللایم ئەز)) (جزیری ، ل ٢١٦) .

**ئاتەشپەرست**

(نك . ، نس . : ئاتەش + پەرست ((پەرستن)) ) . ( بـ . : ئاگرپەرست ) . (( سەکینەی مەرتەبەی سووتانیە ئاتەشپەرستی عیشق * ئەگەر صاحێب ئیرادەت بیٚ عەجەب پیرێکە پەروانە)) (مەحوی ، ل ٢٧٨) .

**ئاتەشپەرستی**

( نج . ، نس . : ئاتەش + پەرست ((پەرستن)) + ی ) . ( بـ . : ئاگرپەرستی ) .

**ئاتەشچەرخان**

(بـ . : ئاتەشگەردان) .

**ئاتەشخان**

(سن . ، هـ .) . (ن . ، نس . : ئاتەش + خان) . ١ـ ( بـ . : مانای یەکەمی ((ئاتوون[١])) ) . ٢ـ چاڵی ژێر مەنجەڵی گەورە ، کە ئاگری تێدا دەکەنەوە . ٣ـ ئاگردان : ((گۆشەی ئاتەشخان دڵەی پڕ جە ئێش * پزیسکەی داخان ئایر وەردا تێنش)) (مەولەوی ، ل ٣٦٥) .

**ئاتەشخانە**

(ن . ، نس . : ئاتەش + خانە) ١ـ ( بـ . : ئاتەشگا ) : ((دڵ لە سینەم هیجرەتی کرد و وتی * بوونە ، عومرێ ، فەرشی ئاتەشخانە بۆچ )) ( مەحوی ، ل ٩٥ ) .
(( جە یاقووت و لاڵ ، جە گەوهەر دانە * کەردن گەنج وەقف پەی ئاتەشخانە )) ( خانای قوبادی ، ل ١٥٧ ) .
٢ـ ئاگرخانەی سەماوەر . لوولەی ناوەڕاستی سەماوەر ، کە جێگەی ئاگرە و سەماوەری پێ دەهێنرێتە کوڵ .

**ئاتەشخوو**

(ئن . ، نس . : ئاتەش + خوو) . خووئاگرین ؛ توند و تووڕە ... ((دیارە خۆ پەروانە هەر سووتانە ئەصڵی مووددەعای * بۆیە ئێمەش عاشقین ، ئەی شەخصی ئاتەشخوو ، بە خووت)) (مەحوی ، ل ٧٨) .

**ئاتەشزەردە**

(بـ . : ئاگرتێبەربوو ؛ سووتاو) .
((فیرقەتی ڕۆژە دەروونی کردە داغێکی سیا * وەك منی سەودا زەردە ئاتەشزەردەی هیجرانە شەو)) (مەحوی ، ل ٢٥٨) .

**ئاتەشکەدە**

(بـ . : ئاتەشگا) .

((حەیرانی برۆ و خاڵی لە ڕووی تۆیە (وەفایی) * بۆچی حەرەم ئاتەشكەدەیی پیری موغانە ؟)) (وەفایی ، ل ١٤١) .

**ئاتەشكێش**

(ن . ، نس . : ئاتەش + كێش ((كێشان)) ) . ( بـ . : ئاركۆڵك[1] ) . ئامێرێكە لە شێوەی بێڵۆكە ، یان خاكەندازێكی بچووكدایە و دەمەكەی كەمێ بە دیوێكدا نوشتاوەتەوە ، پشكۆی ئاگری لە زۆپای داردا پێ دەكێشنە پێشەوە یان پێی دەردەدەن .

**ئاتەشگا**

(ن . ، نس . : ئاتەش + گا ((شوێن : جێگە)) ) . ئاتەشكەدە ؛ ئاتەشگەدە ؛ ئاتەشخانە[1] ...

١ـ ئاگردانی پیرۆزی ئاگرپەرستان . ٢ـ ئەو جێگەیەی پەیڕەوانی ئاینی زەردەشت ئاگریان تێدا ڕادەگرت و ڕێ و شوێنی ئاینی خۆیان تێدا بەجێ دەگەیاند و ئێستا ناوی شاخێكە لە نزیكی پاوەوە : ((چون دووە هەناسەم شەوان تا بە ڕۆ * سەر بەر كەر لە سەر كۆی ئاتەشگاوە)) (مەولەوی ، ل ٣٠٤) .

**ئاتەشگەدە**

( ن . ، نس . : ئاتەش + گەدە ) . ( بـ . : ئاتەشگا ) . (( ئاب و تەبی ئاتەشگەدەی هیجری وەكوو شەمع * نزدیكە منیش واریدی صەحرائی فەناكا)) (شێخ ڕەزا ، ل

٥) . (( پوتخانـــه ب ئـــاگریٚ د شوشـــتن * ئاتەشـــگەدە جملەکی ڤەکوشتن )) (خانی ، ل ٣٨) .

### ئاتەشگەردان

( فـــك . ) . ( ن . ، نـــس . : ئاتـــەش + گـــەردان ) . ئاتەشچەرخان ؛ تاوڵەمە ؛ پۆل گەشێن ؛ پـن چـەرخێن ... ئامێرێکی پیاڵە ئاسایی کون کونی دەسکدارە ، خەڵووز و سکڵی تێدەکەن و هەڵیدەسووڕێنن تا بگەشێتەوە . پتر بۆ سازکردنی ئاگری سەماوەر بەکاردێت .

### ئاتەشناك

(فك .) . (ئن . ، نس . : ئاتەش + ناك) . (ب . : ئاگرین). ((تـیری ئـاهی صوبحگـاهم ڕەنگـە کـون کونکـا فەلـەك * نەشـکی ئاتەشـناکی مـن تـەحقیق نەگاتـە سـەر سمـەك)) (سالم ، ل ٧٧) .

### ئاتەشی[١]

(ئـن . ، نـس . : ئاتـەش + ی) . ١ـــ هـــەر شـتێك لـــە سروشتی گەرمی یان ڕەنگی سووریدا بە ئاگر بچێ : (( نە هەنارن نە شەمامە نە بەهن نـە سـێوی کـاڵ * جووتـیٚ مـەمکی ئاتەشـیی ڕەنگـن بەبـەر دڵـدارەوە )) ( ئـەدەب ، ل ٨٤ ) . ٢ـ مت . : مرۆڤی توند و تیژ ؛ تـووڕە و تۆسـن ؛ سـەرکێش و نائـارام : ئـازاد تـا بڵێـی لاوێکـی ئاتەشـیی ڕەوشتە .

**ئاتەشی[٢]**

(ن . ، نس . : ئاتەش + ی) . جۆرە گوڵەباخێکی ڕەنگ سووری مەیلە و بنەوشە و بۆنی لە گوڵی گوڵاو کەمترە و گوڵاویشی لێ ناگیرێ : ((وەك گوڵی ئاتەشی ، خەمڵیوە بە بەرگی چەمەنی * قامەتی نارەبەرە ، نارووەرە ، نارەوەنە)) (نالی ، ل ٥٢٦) .

**ئاتەشین**

(فك .) . (ئن . ، نس . : ئاتەش + ین) . گەرم وەك ئاگر : لە ڕەنگی ئاگر ... (ب . : ئاگرین) . (( لە بن خاکی مەغاکی ئاتەشینی ، لەعلی لەب توشنە * لەسەر ئابی سەرابی ، سەرووی سێرابی موغەیلانە )) ( نالی ، ل ٤٩٢ ) . (ئەدەب) ((بەو غایەتەش یارت نەبوو نا میهرەبان ئەمما * لە ئاهی ئاتەشینی تۆ خودا بگرێ سەبەب کارت )) ( ئەدەب ، ل ٢٦) . ((گەر بمکوژن لە ئیشی تۆدا ، نابێ میننەتم * ئەم ئارەزووی ئاتەشینە لە من ئاشکارە بوو)) (ئەسیری ، ل ٤٠) . (( بولبول دەناڵێنێ حەزین ، گوڵ دێتە عیشوە و پێکەنین * بگری بە سۆزی ئاتەشین ، هذا طریق العاشقین )) ( وەفایی ، ل ١٠٠ ) . (( دڵ دەسووتێ چین بە چین دەشکێتە سەر یەك وەك فەنەر * خاوەنی ڕووی ئاتەشین و زولفی چین چینم نەهات )) ( کوردی ، ل ١٩ ) .

**ئاتەك**

(ئك) . ١- تەك - لەتەك : تەنیشت - تەنشت - لە تەنیشت : کن - لە کن : نك - کنك : لا - لە لا : کێلەك ، فیز ، بال ...
٢- ڕەخ : ڕۆخ : قەراخ - قەراغ : کەنار : لێوار : ئالی ...

**ئاتەگ**

(ن .) . ١- ئەتەگ : ئەتەك : شاقەل : شاقڵ : داوێن ...
داوێنی کەوای شۆڕ و کورتەك و ستارخانی و مرادخانی و چاکەت ... ((... بە لەقەلەق دەڕۆیشت لە ئاتەگی پالتۆ درێژەکەی هەڵ دەنگووت)) (دایك ، ل ٣١١) . ◊ نوێژ لەسەر ئاتەگی دەکرێ . ٢- دامێن : داوێن : بنار ... لای خوارووی شاخ و کێو : سوارەکان بە ئاتەگی شاخەکەوە بوون . ٣- (ع .) ژێر کراسی ژنانە .

**ئاتر**

(س . : ل .) . ( ئست . : ئاتەر : پە . : ئاتەش ) . (ب . : ئاگر) .

**ئاتشەك**

(ل .) . (ن . ، نس . : ئاتش + ەك) . (ب . : ئاتەشەك) .

**ئاتماجە**

(کس .) . (ن .) . ئاتمەجە : هەڵۆ ... (ب . : هەڵۆ) .
((مینانی تەیری ئاتمەجە * دژمن چەعقێ وی دەرخە ژ هێلوونێ)) ( جەلالی ، ل ٧٢ ) .

**ئاتمەجە**

(بـ . : ئاتماجە) .

**ئاتموسفۆر**

(م .) . (ن) . ( بـ . : ئاتمۆسفێر) .

**ئاتمۆسفێر**

(ن .) . ئاتموسفۆر ؛ ئەتمۆسفێر ... لە وشەی گرێکی (atmos ـ هەڵم : هەناسە) و (sphira ـ تۆپ : گۆ)یەوە کەوتووەتەوە . ١ـ هەوای ڕووپۆشی دەوری زەوی . لە زانستدا ~ بەو هەرێمەی دەوری زەوی دەوترێ ، کە تێیدا ناوچەی گاز لەتەک زەویدا پێکەوە دەسووڕێتەوە و یەکێتییێکی پتەو سازدەکەن . سەرپاکی ~ نزیکەی ١٠ ـ ١٥ر ٥ ت. پێکدێنێ . ~ توانستی ژیان لەسەر زەوی دابین دەکا و کارێکی گەورە دەکاتە سەر ڕووی جۆربەجۆری ژیانی مرۆ . پێکهاتنی کیمیایی هەوای وشکی ~ی دەوری زەوی بەم جۆرەیە : ئازۆت ـ ٠٨٤ ر٧٨ : ئۆکسجین ـ ٢٠ر٩٤٧٦ : ئارگۆن ـ ٩٣٤ر. : کاربۆن ٠٣١٤ر٠ : نیۆن ٠٠١٨١٨ر٠ : هیلیۆم . ٠٠٠٥٢٤ر٠ : میتان ٠٠٠٢ر٠ : کریپتۆن ـ ٠٠٠١١٤ر٠ : هێدرۆجین ـ ٠٠٠٠٥ر٠ و هەندێکی دی ... ٢ـ دانەی پێوانی تەوژم و فشاری هەوا ، کە بە شێوەیێکی فراوان لە بواری فیزیا و کیمیا و تەکنیکدا ڕەچاودەکرێ . قورسایییەکەی هاوسەنگی لوولەیێکی پڕ لە جیوەی

٧٦٠ مليم بەرز . كە بەرانبەر ٠٣٣ر١ كگم لەسەر ١سم[٢] دەوەستێ .

### ئاتۆم

(م . : كی . ؛ كس .) ، (ن) (بـ . : ئەتۆم) .

((كیژی خەڵكی بۆمبی ئاتۆمی دروست كرد و ئەتۆش * هەر دەزانی ناوی (ئەستێوڵك) و (دەرخۆنە) و (پنە) )) (هێمن ، ل ٧٠) . ((بۆمبایێكی ئاتۆم لە دەریای هێمن دەتەقێ لە هەموو شاخ و دۆڵ و سەحرای دووردەستی ئەرزدا دەنگ دەداتەوە)) (مەسعوود ، ل ٤٠٤) .

### ئاتۆمی

(م . : كی . ؛ كس .) . (ئن .) . (بـ . ئەتۆمی) .

### ئاتوون[١]

(كـژ .) . (ن .) . ١ـ توون ؛ توونی حەمام : ئاگردانی حەمام : جەهەننەمی حەمام ؛ دۆژە : دۆزەخە : گوڵخان : گوڵخەن : ئاتەشخان ... جێگەیێكی تایبەتی‌یە بە تەنیشت حەمامەوە ، ڕاهۆڵێكی تێدایە تیانی حەمامی لەسەر دامەزراوە و لەژێرەوە ئاگر دەدرێ و حەمام گەرم دەكا . ٢ـ كووره ( خشت : گەچ ؛ قسڵ ... ) : كڵ ( بۆ سووركردنەوەی گۆزە ) . ٣ـ دۆزەخ : جەهەننەم : ئاگری جەهەننەم : نێتوون ...

**ئاتوون[2]**

(کـژ .) . (ن .) . دەرسدار : مامۆستا : ئوسا : پەروەردەکەر : بەخێوکەر (بۆ ئافرەت) .

**ئاتی**

(سن .) . (ن .) . ئاڵتوون : زێڕ : تەلاّ ... کورتکراوەی (ئاڵتوون)ە .

**ئاج[1]**

(کژ .) . (ن .) . هەلی لەبار : ساتی گونجاو... ~ کەتە وی - هەلی لەباری بۆ هەڵکەوت .

**ئاج[2]**

(کس .) . ( ن .) . (بـ . : عاج) .

**ئاجاخ**

( ئـن ) . دیار : ئاشکرا : بەرچاو : خویا ... ( بـ . : ئاشکرا ) .

**ئاجاڕ**

(ن) . ١ـ بن : بنج : پنج : پنجاڕ ... ٢ـ بنەگیا : پنچگە گیا : ڕەگ و ڕیشەی گیا ...

**ئاجان**

(ل .) . (ن .) . (بـ . : ئاجودان) .

**ئاجز**

(بـ . عاجز) . ((بەنگینەی ، بەڵەك چاوە ! * دەقۆشەنیٚ بگەڕیٚ بزانە کیٚهە ئاجزی کیٚشاوە)) (تحفە ، ل ٢٦٠) .

**ئاجزبوون**

(بـ . : عاجزبوون) . حەسەن گۆت : ((مەم هین غەریبە ، بەلکی ئاجز ببە ژ بنەتن گیانە)) (مەمیٚ ئالان ، ل ١١٨) .

**ئاجزکرن**

(بـ . : عاجزکردن) .

**ئاجزی**

(بـ . : عاجزی) .

**ئاجگی**

(ئن .) . ١ـ ڕژد : پیسکە : پوولەکی : ڕەزیل ، چرووك : چکووس : چکوود : لەچەر : خەسیس : سەفیل : دەستقووچاو : بەرچاوتەنگ : تیٚرنەخۆر : دەس‌وشك : چەش‌تەنگ ... مرۆییٚك توند دەست بە ماڵی خۆیەوە بگریٚ ... × بەخشندە : بەدڵ : دڵاوا : سەغی ... ٢ـ بەخیل : بەغیل : حەسوود : بە ئیٚرەیی : چاونەزیٚر ... ئەو کەسەی چاوی بەرایی نادا خەڵك لە خۆشیدا ببینیٚ و حەز ناکا خەڵك هیچیان هەبیٚ . ٣ـ چاوپیس ، چاڤینۆك ... کەسیٚ کە بە چاوەوە دەکا .

**ئاجوج**

ئەم وشەیە بەتەنیا بەکارناهێنرێ و لەگەڵ وشەی ( باجوج ؛ ماجوج ... )دا دەوترێ . ١ــ خەڵکی زۆری تێکەڵ و پێکەڵ : ( ئای لەو ئاجوج و ماجوجە ) . ٢ــ هەراوهوریا ؛ هەراوزەنا ؛ زەنازەنا ؛ چەقەوگوڕە ...

**ئاجودان**

(م ٠) . (ن ٠) . ئاجان . ئەم وشەیە ئەسڵەکەی (Adjutans)ی لاتینیی‌یە ، کە واتای (یارمەتی‌دەر ؛ یاریدەدەر ...) دەگەیەنێ . فارسەکان لە زمانی فەرەنسی‌یەوە وەریان‌گرتووە و کوردەکانی ئێرانیش بە سێ واتا بەکاری دێنن : ١ــ یارمەتی‌دەری ئەفسەرێکی گەورە ـ واتە ئەفسەرێك کە لەبەر دەستی ئەفسەرێکی سەرکردەدا بێ : ٢ــ ئەفسەرێك ، کە لەبەر دەستی سەرۆکی دەوڵەت بێ و کارێکی تایبەتی پێ‌سپێررابێ (ئاجودانی سەرۆك کۆمار بۆ کاروباری وڵات ... ئاجودانی نیزامی) : ٣ــ بۆ ڕێزلێنان و حورمەت‌گرتن ، بەو پاسەوانانەی پایە و پلەیان لە ئەفەر گەورەتر و لە ئەفسەر بچووکترە .

**ئاجور**

(کف ٠) . (ن ٠) . ئاجوور ؛ ئاجوڕ ؛ ئاگور ؛ ئاگوور ؛ کەرپووچ ؛ کەرپیچ ؛ خشت ... خشتێکی لە کوورەدا سوورکرابێتەوە ... هەندێ ئەم وشەیەیان بە گرێکی

داناوە و بەشێکیش بە عەرەبی ، بەڵام ئەوە دەخەینە بەر چاو ، کە لە (ئاگور : ئاگر ، ئاور ...)ی کوردییەوە زۆر نێزیکە .

**ئاجوڕ**

(بـ . : ئاجور) .

**ئاجوور**

(بـ . : ئاجور) .

**ئاجوول**

(ل .) . (ن .) . (بـ . : ئاجیل) .

**ئاجیل**

(کف .) . (ن .) . چەرەز : چەرەس : شەوچەرە : چورو : ئاجوول . شتی تروو کاندنی وەك نۆکی برژاو و گوڵەبەڕۆژە و ناوکە شووتی و ناوکە کوولەکە و بادام و بستە و فندق ... پێکەوە . ((لە شادی ماڵی بووك و زاوادا شادیکەران بە ژن و پیاو و منداڵەوە هەموو جلوبەرگی تازە لەبەر ئەکەن ، ئاجیل زۆر ئەخورێ)) (سەججادی ، ل ١٠) .((... ئەی خوایە ئەم چیرۆکانەی داڵگە چەند بەلەزەت و بە مەزەن ... بەلای منەوە هەزار ئەوەندەی پاقلە و شەلەمی کولاو و گەنمەشامی و ناکە و ئاجیلی ناو سینەما خۆشترن ...)) . (کۆردەرە ، ل ٧٠) .

**ئاچار[1]**

( كس . ) . ( ن . ) . چاودار : چەودار : چەودەر : چەودەن : چێودان ... دانەوێڵەیەكە وەك گەنم و جۆ : نانیٚ ~

**ئاچار[2]**

(كس .) . (تك .) . (ن .) . (بـ . : ئاچەر[1]) .

**ئاچار[3]**

(فك .) . (ن .) . ترشیات ... هەر خواردەمەنییێك بە ئاوی لیمۆ ، یاخود سركە ، یاخود شتی دی ترش كرابێت .

**ئاچار[4]**

(كس .) . (ن .) . ئاچێر : گوێرەكە : گۆلك ... گوێرەكەی لە ساڵ گەورەتر .

**ئاچارۆكیٚ**

( كس . ) . ( ئن . ) . زەرد : سیس : چرچ ، لاواز : كز : بیٚڕەنگ .

**ئاچەر[1]**

( ت . : ئاچماغ : ئاچمق - كردنەوە ) . ١ـ ئاچار : هاچار : هاچەر : كلیل : كلیت : مفتە : مفتیٚ ... شتیٚ كە قفلٚ دابخا و بكاتەوە . ٢ـ سپانە : جەڕبادەر ... هەر ئامێرێك برغوو توند یان شل بكاتەوە .

**ئاچەر[2]**

(ل .) . (ن .) . چەرخ چەخماخی ئاگرپێکردن : ئاچەرەگەی دەرکرد و دەمی جغارەکەی دا .

**ئاچخ[1]**

(بـ . : ئاچغ) .

**ئاچخ[2]**

(کس .) . (ئن .) . ( بـ . : سەرکەوتوو) . خەباتا ~ - کاری سەرکەوتوو .

**ئاچخی**

(کس .) . (ن . ، نس . : ئاچخ + ی) . ب ~ - بە سەرکەوتوویی .

**ئاچغ**

(ت . : ئاچماغ : ئاچمق - کردنەوە) . (بـ . : ئاچەر[1]) .

١ـ ئاچخ : ئاچوغ : ڕەنگی کاڵ ... ڕەنگی کراسەکەم سەوزی ئاچغە ... ڕەنگی کەواکەت زێدە ئاچغە ... × تۆخ : تاریك ڕەنگ . ٢ـ ئاواڵە : والآ : کراوە : وەکری : ڤەکری : کریاوە : دانەخراوە : لەسەرپشت (دەرگا) ... دەرگاکەتان ئاچغ بوو ، دانەخرابوو .

**ئاچم**

( ل . ) . ( ن . ) . هاچم : هەتشم ... دەنگی پژمین ... (( باوکم دەیوت : ـ ئەگەر بپژمیت هەرچی سەرما

هەیە    لە لاشەتا لە هەردوو کونە لوتتەوە دێتە دەرێ ... خالۆ سیف‌الله لەولاوە لە پڕ ، ئاچم ... ئاچم ... ئا ... چم ژاژوری پژمەی دەست پێکرد )) ( کوردەرە ، ل ٦٤ ) .

### ئاچوغ

(بـ . : ئاچخ) .

### ئاچێر

(بـ . : ئاچار) .

### ئاحا

(ئـ .) . بۆ باوەڕنەکردن و نەسەلماندن و سەرسوڕمانە : ئەحا : ئەح : تەحا : تەح : پەحا : پەح : پێح : پیاح ... بەکر گوتی : (( ئاحا ! دەست هەڵناگرن ئەوا لە قەبریش چوونە پاڵی یەك )) ( تحفە ، ل ٣٣٠ ) .

### ئاحێل

( ن . ) ، ( ئن . ) . ١- پیر : ئیختیار : بەتەمەن : تەمەن درێژ : بە عومر : بە ساڵداچوو : پیر و کۆنە ساڵ ... چوونە عومرەوە . ٢- پەککەوتە : پەککەوتوو : لەکارکەوتە: لەکارکەوتوو : لێکەوتە : لێکەفتە : لێکەفتگ : لێکەوتوو ... لە کار بەرکەنار بوو . ٣- خەڵەفاو : خەرەفاو : خەرەفیو: خەرەفیاگ ... هۆش نەماو لەبەر پیری .

**ئاخ[1]**

( ئـ . ) ١ـ بۆ دەربڕینـی خـەم و خەفـەت و کەسـەر و پـەژارە و بـێزاری و نـاڕەزایی و ناخۆشـی و کڕووزانـەوە . (ئسـت . : ئـەختی) . ئـۆخ : ئـۆف : ئـۆی ... (( ئـاخ چ دەردێکـی گرانـە بـۆ گـەلی کـوردی هـەژار * قـەت بـە دەم ناکرێ بەیانی هێندە سـەخت و کاریـیە )) ( بێکـەس ، ل ١٤٠ ) . (( ئۆف هەزار ئۆف ! ئاخ هـەزار ئاخ ! تا قیامـەت ئاخ و داخ ! * من کە سنگم بەردە ! طەبعم بەرزە چەشنی شاخ و داخ )) (گۆران ، ل ١٨٥) . ((مەمێ گۆت : ئەز نهێرم و تو میرەکی دینی * تو زەلامـەکی فـەقیری ، ژ بۆ چ ئاخ و کەسـەران ب سـەر دلێ خـوەدا دکێشـنە)) (مـەمێ ئـالان ، ل ٧١) . ٢ـ داخ : مخـابن : حـەیف ... حـەیف و ئەسـەف . ((خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت دەوێ * ئاخ مەمی تیایە نەك بـەری کـەوێ)) (پـیرەمێرد ، ل ٢٠١) . ((بـێ تـەورە کریـا خەتەنـە سـووران * ئـاخ چـەند بـێ وەفـان ئـی چـەرخی دەوران)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٢١) .◊ئاخ ئو ئەمان - کڕووزانەوە لە دەست نەخۆشی : ئاخ ئو کەسەر - ئاخ و داخ لـە تینـی ماتـەمی ... ٣ــ ئـا : ئـاه ... خۆزگـە و ئاواتخواستن : ((ئاخ ، خۆزگە هەڵئەفڕی ، ئەمزانی ئاخۆ * ڕاسپێریی چیی پێیە بۆ گیانی پەشێو)) (گۆران ، ل ٢٠٦) . ((ئـاخ وێ کـەنگێ بـێ بـەربانگ * ببـە شـەبەق و سـبە )) (شکۆ ، ل٢٧) . پـ . : ئاخزۆرە ! پـەی زاتـێ - خۆزگـە ئـەم

هێزە زاتێکی لەگەڵدا دەبوو . ٤ـ ئا ... ئای ... نکەنکی نەخۆش لە کاتی ئێش و ئازاردا ... هاوار لەبەر ئازار : ئاخ مێشکم تەقی . ٥ـ ئۆی . بۆ سەرسوڕمان : ((ئاخ شەکەر قەددە ، بەڵا بەندی هەیە قەندی نییە)) (نالی ، ل ٥٩٢) .

ئاخ[٢]

(ن . ، نێ .) . (کژ) . خاك : خۆڵ ، گڵ : تۆز : ئەرد : هەرد : عەرد : ئەرز : عەرز : زەوی : زەمین ... ((ئاخا قەدەما موحتەرەما پایی پەرمە * وەك طوطی پەیاپەی ل زبان شەکەری مە)) (جزیری ، ل ٥٢٠) . ((ڕۆژەك ژ ڕۆژێن خوەدێ ، ئەمێ سەرێ خوە دەنین * دیارێ ڕەحمەتێ ئاخا گۆڕانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٣٩) . ((کوڕۆ ، ڕابە سەرێ خوە هلدە ژ تربا ، ژ ئاخا خالی * باڤێ فەخرییا ئیرۆ برینداره ، مرن ژ مەڕا چێترە ژ ڤی حالی)) (ستران ، ل ٨٤) . ((پادشێ منی جەبارە * ژ دوڕێ عەفراند بوون چارە * ئاخە و ئاڤە و بایە و ئارە)) (خدر ، ل ١٠٠) . ((منێ سوێندەکا مەزنا خاری ب شێخ عەلیێ ل ئاخا زۆزانێ * شێخ فادلێ ل دەرەجا تێلانێ . شێخ حادییێ ل ئاخا گەرمیانێ)) (بامەرنی ، ل ١٤٣) .◊ ئاخا سار - خاکی سارد و سڕ : ئاسوودەی هەمیشەیی : سارد و سڕیی گۆڕ ... ئاخ کەفتن - چوونە ژێر گڵ : لە گۆڕدا ڕاکشان : مردن ... ئاخ ئو بەرێ سار - گۆڕ : مەرگ : سارد و سڕیی گۆڕ :

ئاسوودەی هەمیشەیی ... ئاخیْ گۆڕادا حنە کری - بە خۆڵی گۆڕ خەنە کراوە ؛ بە گڵی گۆڕ سوورکراوە ... ئەمڕۆ وشەی (ئاخ) لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا ، تەنیا لە چەند وشەیێکی کەمی ناسادەی وەك : (ئاخەلێوە ؛ ئاخەبان ؛ ئاخەپوولکانیْ ؛ ئاخباران ... بناخە ...)دا بەرچاو دەکەویْ ، بەڵام لە دیالێکتی ژووروودا ویْڕای بەتەنیا بەکارهێنانی (چ لە زوودا و چ ئەمڕۆ) ، لە چەندین وشەی لێکدراوی ، وەك (ئاخلێڤە : ئاخەبان : ئاخەبانی ؛ ئاخپین : ئاخچە : ئاخپەرست : ئاخکۆلك ...)یشدا بەدی دەکریْ .

### ئاخ ئاخ

( بـ . : ئاخ ) . ( ئاخ ) دەشیْ دووپاتبکرێتەوە و بوتریْ ( ئاخ‌ئاخ) ، ئەمەش پتر تاووتین بە پێکانی مەبەست دەدات : ((هەر ئاخ ئاخمەت پەی دووریی یاران * ئاخم بگێڕۆ وە سەبەبکاران)) (گەرمیان ، ل ٧٣) . ((نە خاوی شەوان ، نەڕوان ڕۆمەن * شەوان هەر ئاخ ئاخ ، ڕوان ڕۆڕۆمەن)) (صەیدی ، ل ٥٥) ... هەندیْ جاریش لەگەڵ (ئاخ ئاخ)دا ئامرازی دی هاوواتای بەکاردێنریْ : ئاخ‌ئاخ و داخ‌داخ ... : ((ئاخ ئاخ و داخ‌داخ ، وەی‌وەی و ڕۆڕۆ * هەر هەشت بە جارێك لێم هاتوونە سۆ)) (پیرەمێرد ، ل ٣٢٦) .

**ئاخافتن**

(چ . ، تێن .) . ئاخافتن : ئاخاوتن : ئاخفتن : ئاخەفتن : ئاخێوتن : قسەکردن : دوان : وتن : گوتن : گۆتن : بێژان : وتووێژکردن : گفتوگۆکردن : پەیڤین ... ((وەکە بژ شکێن زانا ، تو دەچیٚ برینێن من ب نهێرینا چاڤان * بشۆیی و ب ئاخافتنیٚ بشدینی)) (مەمیٚ ئالان ، ل ١١٠) . ((هۆزە سەرەکییەکانی کورد لەو بارەوە کە شێوەی ئاخافتن و هێندێک ئاکار و داب و دەستوور و هەڵسوکەوتیان لێک جیاوازە ...)) (شەرەفنامە ، ل ٢٩) . ((لەبەر چاوی خەیاڵمدا هەزار چەشنە خواردەمەنی ریز کرا : ئاو زایە دەممەوە بەری ئاخافتنی لیٚگرتم)) (مەم[1] ، ل ٢٠) .

**ئاخاڤتك**

(ن .) ، (کژ .) . تلّپ : تلّپە : تلّتە : تلّف : تلّفە : تلّفار : خلّت : خلّتە ... نیشتووی پاڵێوراو (بەتایبەتی تلّتەی رۆن لیٚگیراو) .

**ئاخاڤتن**

( بـ . : ئاخافتن ) . ((جارەکی بووە ئاخاڤتن نێڤ بەر حەلاجی و شێخ جنێدی . حەلاجیٚ گۆتی : ...)) (خدر و خەلیل ، ١٣٣) .

**ئاخاوتن**

( بـ . : ئاخافتن ) . (( ئیدی بە دەم سوحبەت و ئاخاوتنەوە خۆشیان نەیانزانی چۆن گەینە نێزیکی

قەلاّی )) (دمدم ، ل ٦٩) . ((لە دەمودووو قسە و ئاخاوتندا زۆر لەبز شیرین بوو)) (دمدم ، ل ١٧٤) .

ئاخاوك

(ن .) ، (كژ .) . ئاخۆتك : وشە : وتە : گوتە : بێژە : بێژراو : واژە : قسە : لەبز ... (ب . وشە) .

ئاخایۆك

(شن .) . بادیهەوا : بەفیز : بەدەعیە : بەهەوا : ترزل : دەمارزل : لووت بەرز : لەخۆ بایی بوو ... بە كەسێك دەڵێن خۆی بە گەورە بزانیّ و لە گەورەیی نەزانیّ .

ئاخە[1]

(ب . : ئاغا) . ((... ئاخە ! عەشایر قەت دانوویان پێكەوە نەكولاّوە ، لەبەر ڕەقەبەرایەتی و كەریّتی هەر پێیان كراوە بەرەنگاری یەكدی بن)) (بەیتی دمدم ، ل ٧) .

ئاخە[2]

(ل .) ، (ب . : ئاخر[1]) . ((داڵگە ... دەیوت : ئاخە شەو چە وەو باوك سەگە بیشم ...!! )) (كۆردەرە ، ل ٨) .

ئاخەئاخ

(ئ . ، نس . : ئاخ + ە + ئاخ) . نكەنك : نووزەنووز ... (ب . : ٤ـ ئاخ) .

**ئاخەبان**[1]

( ن . ، ئـن . ، نـس . : ئـاخ + ە + بـان ) . هـاوولاّت : هاونیشتمان : هاوشار : هاوزێد : خۆولاّت : هاوخاك ... خەڵكی ولاّتێك .

**ئاخەبان** [2]

( ن . ، نـس . : ئـاخ + ە + بـان ) . ئاخبـان : خابـان : گلّەبان : بانەناو : قوڕبان ... (بـ . : گلّەبان) .

**ئاخەبان** [3]

( ن . ، نـس . : ئـاخ + ە + بـان ) . (هـر .) . چـاوە خانوویێكی سەربانەكەی تەخت بێ : ((كیژ هەر كیژی دوو گوندانە * جێگای خۆشیان (ئاخەبان)ە * كیژیان جوانە لۆ كوڕانە)) (فۆلكلۆر ، ل ٥٧) .

**ئاخەبانوو**

(م .) . (ن . ، نس . : ئاخە + بانوو) . (بـ . : ئاغابانوو) .

**ئاخەبانی**[1]

(ن . ، نـس . : ئـاخ + ە + بـان + ی) . هـاوولاّتی : هاونیشتمانی : هاوزێدی : خۆولاّتی : هاوخاكی ... ( بـ . : ئاخەبان[1] ) .

**ئاخەبانی**[2]

(ن . ، نس . : ئاخ + ە + بان + ی) . (بـ . : ئاخەبانوو) .

**ئاخەپوولکانێ**

(ن . ، نس . : ئاخ ((خاك ، خۆڵ...)) + پوول ((پارە)) + ك ((پاشگر)) + ان ((نیشانەی کۆ)) + ێ) . ناوی یارییێکی مندالأنە : مندالأن کە بۆ ئەم یارییە خڕدەبنەوە ، لە شوێنێك دادەنیشن خۆڵی لێبێت و دەست دەکەن بە کۆمەڵکردنی خۆڵ لەبەردەمیاندا . پاشان پوول و مووروو دادەنێن و خۆڵەکەی بەسەردا دەکەن و لەسەری هەڵی دەچنن . ئەوجاسەرەوژێری دەکەن تا تێکەڵ بە خۆڵەکە دەبن . لە کۆتاییدا دەکەونە گەڕان بە دوای پوول و موورووەکاندا . کێ زووتر بیاندۆزێتەوە ، ئەو دەیباتەوە .

**ئاخەفتن**

(بـ . : ئاخافتن) .

**ئاخەل**

ئاخەڵ ؛ ئاخل ؛ ئاغەڵ ؛ غەڵ ... (بـ . : ئاغەڵ) .

**ئاخەلێوە**

(ن . ، نس . : ئاخ[٢] + ە + لێو + ە) . ئاخلێڤە ؛ خاکەلێوە ... یەکەم مانگی بەهار . سەرەتای بەهار . واتە کاتێ شینایی بەئاستەم سەردەردێنێ و لەو سەردەمەدا کە ئاژەڵ دەلەوەڕێ خۆڵ و گیا پێکەوە هەڵدەگرێ ، ئاخ ( - خاك) بە لێویەوە دیارە . (بـ . : ئاخ[٢]) .

**ئاخەڵ**

ئاخەل : ئاخل : ئاغەڵ ، غەڵ... (بـ . : ئاغەڵ) . ((پایز بوو ، کۆچەر و ڕەوەندان ... گەڕابوونەوە و چووبوونەوە ئارانان تا بۆ پەزەکانیان ئاخەڵی زستان دروست کەن)) (دمدم ، ل ٢١٤) .

**ئاخبان**

(ن . ، نس . : ئاخ[١] + بان) . ئاخەبان : گڵەبان : بانەناو ... (بـ . : گڵەبان) .

**ئاخباران**

خۆڵباران : تۆزباران ... تۆز و خۆڵ کە بەدەم باوە دەبارێ .

**ئاخپ**

(ن . ) ، (کس .) . پەین : سەرگین : شیاکە : ڕیخ : سنێر : ڕەم ... پیسایی وڵاخ .

**ئاخپەرەست**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئاخ[٢] + پەرەست) . خاک پەرست ، بە واتای کەسێك حەزی لە کاری کشتوکاڵ بێ و هەوڵی هێنانە بەرهەمی زەوی بدات .

**ئاخپین**

(کس .) . ( ن . ، نس . : ئاخ ((زەوی)) + پین ((پەین)) ) . زەوی پەین پێوەکراو . زەوی زبڵ کراو .

**ئاخپێن**

(بـ . : ئاخپین) . (( لەو ڕۆژانەدا خەڵکی قەڵا خەریکی شۆم و تۆکردنی بەهارە بوون ، هەندێ هەر لە ئاخپێنەکانی دەوروبەری ماڵاندا دەغڵودانیان دەچاند )) (دمدم ، ل ٢٤) .

**ئاختە**

(ن .) . ئەختە : یەختە : بارگیر : بارگیل : بارگین : یابوو ... بارگیری ژێر بار و کشتوکاڵ .

**ئاخترمە**

(ن .) . ئەخترمە ... ئەسپی لە دوژمن گیراو .

**ئاخچە**

(کژ .) . (ن . ، کس . : ئاخ[٢] + چە) . (بـ . : گەرد) .

**ئاخچەباش**

( ن . ، نس . : ئاخ[٢] + چە + باش ) . گیاییێکی بۆن خۆشە و بەهاران شین دەبێ . گەڵای وەك گەڵای یاسەمینە و دەکرێتە ناو دۆکوڵیوەوە .

**ئاخچیوبووخچی**

( ن . ، نس . : ئاخ + چی + ە + و + بووخ + چی ) . ناوی یارییێکی منداڵانە : دوو منداڵ ڕووبەڕووی یەك دادەنیشن و بنی پێ دەنێن بە یەکەوە و دەستی یەکدی

دەگرن و بە نۆزە خۆیان بە پشتدا دەنوشتێننەوە و یەکتری ڕاست دەکەنەوە و بە دەمیەوە دەڵێن : ((ئاخچی بووخچی ، دایە و بابە سندووقچی... لە هەندێ ناوچەش : ((یەکەم : ئاخچی : دووەم : بووخچی : یەکەم : هێلکەوڕۆنم : دووەم : بۆ دزی : یەکەم : لە کۆڵانەکە : دووەم : هەڵخزی)) .

**ئاخداخ**

(ئـ . ، نس . : ئاخ[1] + داخ) . ئاخ ئۆخ : ئاخ ئۆف : ئاخ حەیف ... ( بـ . ئاخ[1] ١ و ٢ : داخ[1] ) . جەخت لەسەر توندی و وزەی کەسەر و پەژارە و حەیف و ئەسەف دەکا : ((بێ لەیل ، ئاخ ، ئامێ جە ئێڵاخەوە * پەی ئاخداخ تەک بە (ئاخداخ)ەوە)) (مەولەوی ، ل ١٦٣) . ((ئاخداخ نوختەی خاڵ شێوە حوور * حەسرەتەن بەرێم تاوە نەفخ صوور)) (جەفایی ، ل ٧٥) .

**ئاخدار**

( ئن . ، نس . : ئاخ[1] + دار ) . ١ـ خەمبار : غەمبار : خەفەتبار : خەمگین : غەمگین : دڵبریندار : مەینەتبار ... کەسێ خەم و خەفەتی هەبێ ((ئاخ ، چراخ ! چ ئاخ ؟ ئاخ پەی ئاخدارێ * چون من خاطر خار ، خەمبار ، داخدارێ )) ( مەولەوی ، ل ٥٥ ) . ٢ـ ئاخهەڵکێش : گازندۆک : بەپرتەوبۆڵە : دەم بەگلەیی ... ٣ـ بەدبەخت :

بەوبەخت : بێبەخت : کلۆڵ : نەگبەت : چارەڕەش : بێوڵەت ...

### ئاخر[1]

(ع . : آخر) . (ن . : شن . : نك.) . ١ـ ئەنجام : ئاکام : ئاقیبەت : دوایین : پاشین : پاشینە : دواڕۆژ ... ئاکام و ئەنجامی کارێك یان شتێك ... ((دەوەن ئاخر دەبێتە داری گەورە * مەڕی لەڕ خدمەتی بۆ گۆشتی چەورە)) (کۆیی ، ل ٢٦٠) . ((سەری دانا لەسەر ڕووی تۆ ، بە شوێنی زوڵفی تۆدا چوو * (وەفایی) ئاخری خێربێ ، دەمێکە بێ سەر و شوێنە)) (وەفایی ، ل ١٤٦) . ◊ ئاخری خێر بێ - نزا و دوعایە بۆ کارێك یان کەسێك ، کە ئێستا باش نەبێت و داوای ئەنجامی باشی بۆ بکرێ ... ٢ـ کۆتایی : دوایی : دوماهی : هەرەدوا ... هەر شتێك لەچاو هاوچەشنەکانی خۆی لە دوای هەموانەوە بێت ... × سەرەتا : ئەوەڵ : یەکەم : هەوەڵ ... ((تاقانە یەتیمی خەلەفی ئاخری نیسان * تۆ خۆش بی ، صەدەف بوو بە فیدات ، دوور بی لە ئافات)) (نالی ، ل ١٣٨) . ((شێخ لەگەڵ پەنجا کەسی مەشغوولی ڕاحەت بوون بە ڕۆژ ئاخری مانگی بەهار و ئاوباریك بوو محەل)) (حەمدی ، ل ١٠٢) . ((بنوارە بوونی ئەووەڵت و چوونی ئاخرت : * هاتی چ ڕووت و قووت و ، هەلاتی چ لووس و پووس ؟)) (نالی ، ل ٢٣٩) . ((سەراسەر دەفتەر تۆ مارش وانام *

ئەوەڵ تا ئاخر شەرحی حاڵ زانام)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ٨٥) . ((... هاواری مـن وەبـەر پێغەمبـەری ئـاخری زەمان)) (بەیتی دمدم ، ل ١١) . پـ . : ئاخری پیری جۆ بە تیری - بە پیرێك دەوترێ ، بە کارێکی گرانەوە خەریك بێ . ئاخری عومر و هەوەڵی ترۆیی - بە یەکێك دەوترێ لە پیریدا دەست بداتە بەدکاری ... ٣- دوا : دوما : پاش ... ((ئـاخر بـەهاری نەوجوانیمـە * ئـەوەڵ پـایزی زیندەگانیمە)) (پیرەمێرد ، ل ٢٤٠) . ((بەسەر پایزی زەردا با بە خوڕ بگری ، بەکوڵ بگری * لەسەر ئاخر گەڵا ، ئاخر چڵی تەنیایی گوڵ بگری ! )) (گۆران ، ل ١٦٥) . ((ئـاخر سـەفەرەن ، ڕا خـەیلێ دوورەن * مـەنزڵ بێپایـان تۆشـە زەروورەن)) (مەولەوی ، ل ٦) .

ئاخر[٢]

(ئـ .) بۆ وریاکردنەوە و جەختکردن و سەرزەنشت کردن و لۆمە و گلەیی ... دە : دەسا : ئیتر : ئیدی : خۆ : جا : مەگەر ... ((وتی : ئاخر ئەوەی منیش عەرزم کردن و نووسیومە ، ئـەم مەسـەلەیەیە)) (لـە خـەوما ، ل ٥٤) . ((تەشبیهی حوسنی فائیقی ، ئـاخر ، بـەچی بکـەم ! * نووری سنووحی طەلعەتی صەد لەوحی ئەنوەرە)) (نالی ، ل ٤٢٦) . ((ئاخر وەرە بچینە کن ئەوی لێبکە سڵاوە ؛ * ئاخر دایك و بابی نین لە تـوو زیاتر کەسـی نـەماوە)) (تحفـە ، ل ٣٥٧) . خوێنـی دڵ لەبەرچاوم نـەبێ تـا کـەی

ڕەوان ئاخر ! * ئەوا ڕۆیی لەبەرچاوم ڕۆحی ڕەوانم بوو)) (مەحوی ، ل ٢٦٢) . ((ئاخر تو ئەگەر نەکی وەفاییٚ * ئەووەل مە دە خوە وی جەفاییٚ)) (خانی ، ل ٩٨) . ((نا ئاخر ئەوانە هەڤالێ تەنە ، * تەڕا دلیزن ، ئەو گونەنە)) (چریکە ، ل ٢٤) . ((باڤێ ژێڕا گۆت : دە ئاخر من تەڕا گۆت...)) (کوردۆ ، ل ١٥٧) . ((برایێ مەزن دبێ : ئاخر ئەم شفانن ، ستییێ قیزا بەگانە ، ئاشقلییێ فەرخکە ، چەوا هەڕن ستییێ بخازن ؟)) (زارگۆتن ، ل ٢١٩) .

### ئاخرەت

(بـ . ، ئاخیرەت) . ((مرنا تەڕە مایە دوو سعەت و سێ سعەتانە * تو ئی ژ ڤێ دنێ بارکێ هەڕێ ئاخرەتێ ، حزورا پادشاهێ پادیشانە)) (مەمێ ئالان ، ل ١٠٥) . ((کێژێ گۆ : ما ئەز نەیە تووژم * ئەز نەبییا ناکوژم * دێ دلرۆژا ئاخرەتێ و دۆژێدا سۆژم)) (خدر ، ل ١٠٦) . . . ئەز تە هەتا ڕۆژا ئاخرەتێ بیرناکم – من تۆ تا ( ڕۆژی قیامەت : کۆتایی ژیان : کاتی مردن ... لەیاد ناکەم . ◊ برێ ئاخرەتێ (ژن بە پیاوی دەڵێ) . خوشکا ئاخرەتێ (پیاو بە ژنی دەڵێ) .

### ئاخرەکەی

(بـ . : ئاخری : ئاخرییەکەی) . ((لە ڕێگا مام ڕەجەب دەیەویست شتێکم پێ بڵێ ، بەلاٚ بۆی نەدەکرا .

ئاخرەکەی بە ئەدایەکی تایبەتییەوە پرسی)) (گێلەپیاو ، ل ١٧٧) .

### ئاخرەمین

( عک . ) ، ( ئن . ، نس . : ئاخر ((ع .)) + ەمین ) . دوامین : دواترین ، دواگین : دوای هەموان : پاش هەموان : هەرە دوایی ... هەر شتێك لە چاو هاوچەشنەکانی خۆی ، یان هەر کەسێك لە چاو هاوپۆلەکانی خۆی لە هەرە دوای هەموانەوە بێت ... × هەوەڵەمین : یەکەمین ...

### ئاخربوون

(عک .) . (چ . ، نس . : ئاخر ((ع)) + بوون) . ١ـ دوایی هاتن : کۆتایی هاتن ( تەنیا بۆ دنیا ) . ٢ـ خراپبوون : ڕووخان : ڕمان : تێك چوون : سەرەونگوونبوون : (تەنیا بۆ دنیا) .

### ئاخرپیری

(عک .) . (ن . نس . : ئاخر (ع .) + پیر + ی) . پیریی تەواو ... ((ترحیو ، جوان دای مرازم ، ئاخرپیری و وەجاخ کوێری و مەعرەکەگێڕی ...)) (هیچ ، ل ٤٢) .

### ئاخرخێر

(ع .) . (ئن . ، نس . : ئاخر + خێر) . ١ـ کەسێك کاروبار و ژیانی بە چاکی و خۆشی دوایی بێت . ٢ـ پیری

پیاوچاك : پیری دیندار ؛ پیری بە دین ؛ پیری لە خوا ترس ... كەسێك كە دوایی تەمەنی بە دینداری بەرێتە سەر . ◊ ئاخر خێر بێت : ١ـ نزا و دوعای چاكە بۆ یەكێك ؛ ٢ـ بە پیرێك دەوترێت چاكەی لێبوەشێتەوە و لەوە دووربێ، كە خراپەی بۆ كەس هەبێت .

ئاخرزەمان

( عك . ) . ( ن . ، نس . : ئاخر + زەمان ) . ١ـ كۆتایی هاتنی ئەم دنیا : نزیكبوونەوەی ئەو دنیا ((عاقیبەت هەر چاوی بەد بوو كاري لێكرد و نەما * داخی دەرناچێ لە دڵ بە خوا هەتا ئاخرزەمان)) (بێكەس ، ل ١٧١) . ٢ـ بەو ڕۆژگارە دەڵێن ، كە كەوتووەتە دوای پەیامبەری ئیسلامەوە ((دڵم ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ ، لەبەر ئەوێ ژانێ : * بانگێكم وەبەر خولای ، ئەوی دیكەم بەر پێغەمبەری ئاخرزەمانێ)) ( تحفە ، ل ٢٠١) . ((گەلی برا مێرێ چێ بن ب دانێ ، * خەبیر بن ب ئەركانێ * ژ عەول دنێ هەتا ب ئاخرزەمانێ)) ( خدر و خەلیل ، ل ٧٨ ) . ٣ـ مت . : ڕۆژگاری ناخۆش و ناهەموار و پڕ ئاژاوە ، كە كەس ئاگای لە كەس نەبێ و هەر كەسە فریای خۆی بكەوێ ((دار و بەرد هاتە هەژیانێ : * تۆز گرتی بەری ئاسمانێ ، * بووە ڕۆژی ئاخرزەمانێ)) (تحفە ، ل ٢٠٥) . ((بۆ هەوا ئالۆزە بۆچی لێل و سوورە ئاسمان *

گێژەڵووکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخرزەمان)) (حەمدی ، ل ٩٦) .

**ئاخرسەر**

(ل .) . سەرەنجام : کۆتایی : ئاقیبەت ... (بـ . : ئاخر[1]) .

**ئاخرسۆنگی**

(کس .) . ( بـ . : ئاخری) .

**ئاخرشەڕ**

(عك .) . (ئن . ، نس . : ئاخر + شەڕ) . ١ـ پیری بەدخوو : پیری بەدکار : پـیری بەدفـەڕ و نـەگریس ... مرۆڤـێـك لـە کـاتی پـیری و دوا ڕۆژانـی تەمـەنیدا لـە ڕێـگـای ڕاسـت لای‌دابێ و دەستی دابێتە ڕەوشتی خراپ و بەتایبـەتیش کاری پێچەوانەی دین . ٢ـ پیری بەدبەخت : پیری نەگبـەت : پـیری نـەدار : پـیری نارەحـەت : پـیری چـارەڕەش ... کەسێك لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا تووشی بەلاّ و ئێش و ئازار بووبـێ (( ئـەوەند قسـەت کـرد نـانی خـۆت بـڕی * مـاڵت وێران بێ چەند ئاخرشـەڕی )) (بێکـەس ، ل ١٤٥) . × ئاخرخێر .

◊ ئاخرشـەڕ بیت : ١ـ نزا و دوعـای خراپـەیە بـۆ یـەکێك : ٢ـ بە پیرێك دەوترێ ، کـە خراپـەی لێبوەشـێتەوە ، چ بـە زمان ، چ بە کردەوە .

**ئاخرشەڕی**

( عـك . ) . ( ن . ، نـس . : ئـاخر + شـەڕ + ی ) .
١ـ بـەدخوویی : بـەدکاری ... بەدفـەڕی و نەگریسـی ...
٢ـ بەدبەختی : نەگبەتی : نەهامەتی : نەداری : ناڕەحەتی :
چەرمەسەری : چارەڕەشی ((لـەژێر باری خـەما واشـانی
صەبرم ڕێشە ئێستاکە * فیراقی یار لەبەر ئاخرشـەڕی لێم
بـوو بـە سـەرباریێ)) (کـوردی ، ل ٧٦) . ((تـاقمێکی تـازە
کـوورەی ڕووتەڵـە جا دەرپـەڕی * عالـەمی زانـی ئەمانـە
ئەوەڵی ئاخرشەڕین)) ( حەمدی ، ل ٨٥) .

**ئاخرقە**

(کس .) . (بـ . : ئاخری) .

**ئاخرکە**

(ن .) . ئـاخوێرك : هـووڕە ... جـۆرە مێشـوولەییێکی زۆر
وردە .

**ئاخرکردن**

( عك . ) . ( چ . ، تـێ . ، نـس . : ئـاخر + کـردن ) . ١ـ
دواپێهێنان : کۆتاییهێنـان ( تـەنیا بۆ دنیـا ) . ٢ـ خـراپ
کـردن : تێكدان : ڕووخـاندن : ڕمـاندن : سـەرنگوونکـردن
(تەنیا بۆ دنیا) .

### ئادەی

(ئـ . ، نـس . : ئـا + دەی) . ١ــ دەی ؛ دادەی ... ئـەم ئـامرازە بـۆ دنـەدان و هـاندانی کردنـی کـارێك ، یان وریاکردنـەوەی کەسێك بـەکاردێنریٚ ((ــ دە کەوایـە ، نـەیارن و ناتانگەرەکـە قسـە لا ئێمـەی کـورد بدرکێنـن ، ئادەی بیانبەن ، لە پشت ئـەو کۆنـەوە بیانکوژن)) (دمدم ، ل ٣٠٢) . ((ئەگەر مەردی ئادەی شەقیٚ لەناو دەمی دەریا هـەڵدە)) (قەرەداغی ، ل ٩) ... (بــ . : ئـا[٧]) . ٢ـ ئـا بـزانم چـۆن ... ((وتم باشـە دەڕۆیـن بـۆ ئیسـپانیا ، بـەڵام بـە مەرجێك . وتی : ـ ئادەی . ـ لە شاری (بەرشلونە) دووربین کە باوکتی تیـادا دەژی)) (کـۆردەرە ، ل ٢١٦) ... ( بــ . : ئا[٤] ) .

### ئادر

(د .) . (ن .) . (بـ . : ئاگر) .

### ئادرەس

(فــر . : adresse ) . (ن .) . ئـادرێس ؛ ئـەدرەس ؛ ناونیشـان ؛ عینـوان ... ناونیشـانی شـوێن و مەڵبـەندی دەزگایێك ؛ بەرێوەبەرێتییێك ؛ماڵێك ؛ دوکـانێك ... یـان جێگـە ژیانی کەسێك (( (واسیل) ئادرەسـی خـۆی دامـیٚ و گوتی : ـ هەر کاتێك بەرەڵاٚ کرای وەرە لای من کارم پێنە . ـ هەرچەند ناکریٚ باوەڕ بەو بەڵێنانە بکەی کە بەندییەکان

**ئاخرهەناسە**

دواهەناسە : تا مردن ... ((بلاٚ ڕۆحت موقەددەس بیٚ ، ئەم و ئەو کردنت بەس بیٚ * هەتا ئاخرهەناسە ئەو بناسە ، هەر بنازە بەو)) (مەحوی ، ل ٢٦١) .

**ئاخری**

(عک .) . ( ئک . ، ئن . ، نس . : ئاخر + ی ) . لە کۆتاییدا ؛ لە ئەنجامدا ؛ دەرئەنجام ؛ سەرئەنجام ... ((ئاخری ڕۆیین بۆیان چۆڵ کردین * ئەگەرچی نەختیٚ پارەشیان بردین)) ( بێکەس ، ل ٩٥ ) . ((تا لە بەینا بیٚ ئەم شەڕوجوێنە * ئاخری ئەبێتە چڵکاوی سوێنە)) (پیرەمێرد ، ل ٢١٥) . ((... شیرێکی لە دەستی دا دەستی پەڕان ، ئاخری خانیان کوشت ، لەشکری خانیان شکان ...)) (تحفە ، ل ١٨١) . ((ئەبینی ئاخری ڕۆژیٚ سوقووط ئەکا مەقهوور * لە ژێری پیٚیی عەجووزا ئەبێتە تۆز و غوبار !)) (گۆران ، ل ٧٠) .((... ئاخرییێدا عەلی مەمەد گەلەکی وەستیا ، ل سەر کەڤرەکی ڕۆنیشت)) (کوردۆ ، ل ٣٤) ... ◊ ئاخری و ئاقیبەت (عاقیبەت - کۆتایی و ئەنجام ؛ ئاخری و ئاقیبەتی / عاقیبەتی - لە کۆتایی و ئەنجامدا .

**ئاخرییەکەی**

(بـ . : ئاخری) . ((فەرماندەکانی لەشکری (ورمیٚ) و (مەهاباد) و (سەردەشت) کەوتنە ڕا و تەکبیر ،

ئاخرییەکـەی بڕیاریـان دا لەگـەڵ کوێخـا هۆمـەری (سویسنی) وتووێژ بکەن)) (قزلجی ، ل ٤٢) . ((گەورەکـە سـەری بـەرزکردەوە ... وتـی : تـۆ نـابێ قـەت قسـەییێکی ڕاسـتت ببـێ . ئاخرییەکـەی تـۆ سـەری مـن بـە فـەتارەت ئەدەیت)) (لەخەوما ، ل ٤٨) .

**ئاخزه**

(بـ . : ئاغزه) .

**ئاخسبات**

(ز .) . (ن .) . پازده ڕۆژی ئاخری چلەی زستان .

**ئاخستان**

(کـژ .) . (ن . ، نـس . : ئـاخ[1] + سـتان) . بـە زەوییێـک دەوترێ بۆ کشتوکاڵ دەست بدات .

**ئاخش**

(ز .) . (ئـ .) . ئۆخـەی ؛ ئۆخـەیش ... بـۆ دەربڕینـی خۆشی بەکاردێنرێ .

**ئاخفتن**

(بـ . ، ئاخافتن) . ((هەکه مـه ل دۆڤ ڤەکۆلینا خو کاری ب دروسـتی بنـج و ڕەهـا ڤـێ ئـاخفتنی شـرۆڤە بکـەین)) (خدر و خەلیل ، ل ١٧) .

**ئاخڤی**

(کس .) . (ئنب . ، نس . : ئاخڤ ((ئاخڤین)) + ی) . هەوکردوو : داهاتوو ؛ تێزاو : داگیرساو ... چاڤێد ئاخڤی - چاو (ان)ی هەوکردوو .

**ئاخڤین**

(کس .) . (چ . ، تێن) . هەوکردن : داهاتن ؛ تێزان : داگیرسان : سووتانەوە ... برینا وی ئاخڤییە - برینی ئەو هەوی کردووە .

**ئاخکۆلك**

( کژ . ) . (ن . ، نس . : ئاخ[1] + کۆلك) . زنج ؛ کوخ ؛ کۆختە ، قولیت ... کۆخێك لە قوڕ دروست کرابێ (بـ . : کوخ) . ((هەمووا هنەك ئاخا ژ ئاخکۆلکا بەرهەڤ کری ، چونکە مەها نیسانێ نایت عەردی ب کۆلن گونهەیە عەردی ئاڤزە)) (خدر ، ل ٩) .

**ئاخکێش**

(نك . ، نس . : ئاخ + کێش ((کێشان)) ) . (بـ ، : ئاخ هەڵکێش) . (( ئاخکێش زۆخ نۆش ، زام نە دەروونم * وێنەی مەجنوون وێڵ ئاوارەی توونم)) (وەلیی دێوانە ، ل ٨٩) .

**ئاخکێشان**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئاخ[1] + کێشان ) . ( ب . : ئاخهەڵکێشان ) .

**ئاخل[1]**

(کژ .) . ( ن .) . ئاخڵ : ئاخەل : ئاخەڵ : ئاغەڵ ، غەڵ ... (ب . : ئاخڵ[1] ؛ ئاغەڵ) .

**ئاخڵ[2]**

(کژ .) . (ب . : ئاخڵ[2]) .

**ئاخلەویك**

(ب . : تاوە ؛ ئاخڵەوێك) .

**ئاخلەوینگ**

(ب . : تاوە ؛ ئاخڵەوێك) .

**ئاخلێڤە**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئاخ[2] + لێڤ + ە) . (ب . : خاکەلێوە : ئاخ[2]) .

**ئاخلێڤینگ**

(کژ .) . (ب . : تاوە ؛ ئاخڵەوێك) .

**ئاخڵ[1]**

(ن .) . ١ـ (ب . : ئاخوڕ ؛ ئاخڵە[2] ١) . ٢ـ جێ و شوێنی هاوینەی ئاژەڵ ((ئانین هەمی میر تژیی ڕەزکر * ئاخڵ کو شڤان تژیی پەزکرد)) (خانی ، ل ٢٠٢) .

**ئاخڵ** [٢]

(کڕ.) . (ئن .) . خاپوور : داڕوخاو : داڕوخیاو : داڕوخیاك : داڕماو ...

**ئاخڵە** [١]

( ن . ) . ١- خەرمانە : خەرمانەی مانگ : تەم و مژێ ، کە شەوان لەبەرچاو بووبێتە جغزی دەوری مانگ . ∴ ئاخڵە لە دەوری مانگ دیارە .

**ئاخڵە** [٢]

(ن . ) . ١- (بـ . : ئاخوڕ) . ٢- (بـ . : کاوان) . ٣- کەلارە : دیوارێکی نزمی لە تەپاڵە دروست کراوە ، کە لە ناویدا ئاگرادنێکی تێدایە بۆ نانکردنی ژنان لە هاویندا . ٤- ( بـ . : خەرمان ) .

**ئاخڵەدان**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئاخڵە + دان ) . ١- خەرمانەدان ، دروست بوونی ئاخڵە ( خەرمانە ) لە دەوری مانگ . ٢- خڕبوونەوەی خەڵك لە شێوەی دایرەدا لە دەوری کەسێك یان شتێك . ٣- پاپۆکەخواردن : پەپکەخواردن : پێچ خواردن : پەپۆکەدان : خۆلوولدان : ئەڵقەدان : لوولبوون ... ( بۆ مار ) . ∴ مارەکە ئاخڵەی دابوو .

**ئاخڵەوێك**

(ن .) . تاوە : ئاخڵویك : ئاخڵەوینگ : ئاخلیڤینگ ... (ب . تاوە) .

**ئاخڵێف**

لاف و گەزاف : درۆ و دەلەسە : بافیش ... بۆ كەسێك خۆی هەڵكێشێ و تاریفی خۆی بكا .

**ئاخماخ**

(ع . ، احمق) . (كس .) ، (ئن .) ئەحمەق : گێژ : گێل : حۆل : گێژ و حۆل : دەبەنگ : نەفام : بێئەقڵ : بێئاوەز : بێهۆش : تێنەگەیشتوو ... ( ب . : ئەحمەق) .

**ئاخماخی**

(عك .) . (ن . ، نس . : ئاخماخ ((ع . : احمق)) + ی) . ئەحمەقی : گێژی : گێلی : حۆلی : گێژوحۆلی : دەبەنگی : نەفامی : بێئەقلی : بێئاوەزی : بێهۆشی : تێنەگەیشتوویی ... بـ ~ - بە ئەحمەقی : بە گێژی : بە گێلی ...

**ئاخماخیكردن**

(عك .) . ( چ . ، تێن . ، نس . : ئاخماخ ((ع . : احمق)) + ی + كرن ) . بێئەقلی نواندن : كردنی كارێكی نەفامانە ...

**ئاخمە**

(د . ) . (بـ . : بەلاڤ) .

**ئاخمەبیایەنە**

(د .) . (بـ . : بەلاڤ بوون) .

**ئاخناو**

(بـ . : ئاخنراو) .

**ئاخندران**

(بـ . : ئاخنران ؛ ئاخنین) .

**ئاخندراو**

(بـ . : ئاخنراو) .

**ئاخنران**

(چ . ، تێن . / کب . ، نـس . : ئاخن ((ئاخنین)) + ر + ان) . ( بـ . : ئاخنین : ئاخندران ) . ((بەندییێك ، تا سەر حوکم درابێ * سندم لە پێی بێ و کەلەپچە لە دەست * لە زیندانێکی تەنگ ئاخنرابێ * چەند سوارچاکانە ، خەو بە ئەسپی شێ و (با)وە دەبینێ)) (پەشێو ، ل ١٢٢) . ((سەدان خێزان ، بێ باوك و برا و مامە و خاڵە بوون و لە گرتووخانە ئاخنراون)) (بەرەو لوتکە ، ل ٧١) .

**ئاخنراو**

(ئنب . : ئاخن ((ئاخنین)) + ر + ا + و) . ئاخندراو : ئاخناو : پەستاو : پەستواو : تیٚپەستراو : هەلاٚخندراو : هەلاٚخنراو ... پڕکردن و داگرتنی دەفرێك تا لیٚوان بە پتەوی : یان توند و باش گرتنی کونیك ... ((ئاخنراوە کونەڕەش * نابینی کەسیٚ ڕووگەش)) (هیٚمن ، ل ٩٦) .

**ئاخنەبا**

(ن .) . دوا ڕۆژەکانی زستان ، دەمیٚ حەوت ڕۆژی چلە مابیٚ .

**ئاخنین**

(چ . ، تیٚ) . ١ـ پەستاوتن : تیٚپەستاوتن : پەستاندن : تەپاندنەناو ...ی شتێك لە شتێکی دی . بەویٚنە ، پتەو تیٚڕاکردنی لۆکە و خوری بۆ ناو لیٚفە و دۆشەك : یان پڕکردنی دەفر و داگرتنی گویٚنی و بار . (( سەری ئاخنییە کۆشییەوە و بەکوڵ دەستی کردە گریان )) ( شار ، ل ٦٠ ـ ٦١ ) . (( من شیلەگەم هەڵبڕیوە * من یەك سەریم ئاخنیوە )) ( هیٚمن ، ل ١٨٧ ) . ٢ــ پڕکردن : سەرلیٚوان کردن ... ((زۆر حەیوانی دوو پیٚی وام دیتن کە بە ڕواڵەت ئینسان بوون ، کەچی لەو وەزعە نالەبارە بۆ ئاخنینی گیرفان یا دامرکاندنی هەوەسی خۆیان ، کەڵکیان وەرگرت)) ( هیٚمن ، ل ٣٤ ) . ٣ــ داکردن : کۆکردنەوە :

ئەنبارکردن ... شت داکردن لە ناو ئەنباردا . ∴ گەنمەکەم ئاخنییە ئەنبارەکە . ٤ـ گرتن : بەستن : داخستن : قەپات کردن : کونبڕ کردن ...ی کون ، زارکی دەفر ، کولانەی مریشک ، گولێنەی تەنوور ... ∴ هەموو کونەکانم بە پەڕۆ ئاخنیوە : کون و کەلەبەر نەماوە نەیئاخنێ : بە تۆپەوانە زارکی کووپەکەم ئاخنیوە ... ((... بە پەڕۆ کۆن دەلاقەی ئاخنی)) (خەندە لێو ، ل ٤٧) . ٥ـ تێترنجاندن : تێتەپاندن : تێخستن...ی شتێک بۆ ناو شتێکی دی بە زۆر و بە ناڕەحەت ((ئەو نووسەرە ساویلکانەی لە دوژمنایەتیی کوردان بۆ دراوی گیرفانیان ئەو چیرۆکەیان هەڵبەستووە و ئەم بوختانە گەورەیەیان بۆ پێغەمبەر کردووە و دە ناو ڕووپەڕی مێژوویان ئاخنیوە ...)) ( شەرەفنامە ، ل شازدە ) (( ... خۆم ئاخنییە ژێر جێگا گەرم و گوڕەکەوە دەستی ڕاستم بۆ لاڵەکە درێژ کرد و فتیلەکەیم داگرت )) ( بەرەو لوتکە ، ل ٧٤ ) . ٦ـ مت . : زۆر خواردن : تێترانـدن ... ( بـ . : تێئاخنین ) .

ئاخنینەوە

(چ . ، تێ . ، نس . : ئاخنین + ەوە) . هەمان واتای (ئاخنین) دەگەیەنێ ، بەڵام دوو تایبەتیشی هەیە : ١ـ پەستاندنەوە : کوتانەوە : داگرتنەوە ...ی شتێک بۆ

جاری دووەم . ٢ـ بۆ ئەو جۆرە شتانە بەکاردێنرێ ، کە ماوەیێك لەناو دەفردا دەمێنێتەوە : ∴ هەشت پێستە پەنیرم ئاخنیوەتەوە ... مام شاسوار خەریکی ئاخنینەوەی گوویە شیرێژە .

**ئاخوا**

(ئـ .)ی پرسیاری (نس . : ئا + خوا) . (بـ . : ئاخۆ) .

**ئاخواندن**

(کژ.) (چ . ، تێ .) . (بـ . : خوێندنەوە) .

**ئاخویرك**

(ن.) . (بـ . : ئاخرکە) .

**ئاخو**

(د .) . (بـ . : زەهر : ژەهر) .

**ئاخوئۆخ**

(ئـ .) بۆ دەربرینی خەفەت و ناڕەزایی ، (نس . : ئاخ + و + ئۆخ) . (بـ . : ئاخ[١] ١ـ ؛ ئۆخ ١ـ ؛ ئاخوداخ) . ((یەك ل سینە یەك ل دلدا * لەو ژمن تێن ئاخوئۆخ)) (جزیری ، ل ١٩٠) . ~ هەڵکێشان ((ئنجا تەوێڵی خستە سەر هەردوو مشتی و کەوتە ئاخوئۆخ هەڵکێشان)) (خەندە لێو ، ل ١٨٥) .

**ئاخوئۆف**

( ئـ . ، نـس . : ئاخ + و + ئـۆف ) . بـۆ دوو مەبەسـت بـــەكاردێنرێ : ١. نیشــــاندانی پـــەژارە و وەڕزی ؛ ٢ـ ڕاگەیاندنی ئێش و ئـازار . ( بـ . : ئاخ[1] ١ـ ؛ ئـۆف ؛ ئاخوداخ ) .

**ئاخوئۆی**

(ئـ . ، نس . : ئاخ + و + ئۆی) بۆ دەربڕینـی خەفـەت و هاواری دەرد ((وەك چهرەی خەیاڵ ڕوخسارەکەی خۆی * لە پەردەی دڵەی پڕ لە ئاخوئۆی)) (پیرەمێرد ، ل ١٢٩) .

**ئاخوداخ**

(ئـ . ، نس . : ئاخ + و + داخ) . ئاخوئۆف ؛ ئاخوئۆخ ؛ ئاخوئۆی ؛ ئاهونالـە ؛ ئـاهوواە ؛ ئـاخوواخ ؛ ئـاخۆ[2] ؛ بـۆ دوو مەبەست بەكاردێنرێ : ١ـ بـەردەوامی لـە دەربڕینـی خـەم و خەفـەتدا ڕادەگەیـەنێ و تـاووتینی پـەژارە نیشـان دەدا : ((لە كوردی بگرە هەتا تورك و عارەب و عەجەمی * لە ئاخوداخی دەسووتێن و شین دەكەن دەگرین)) (كۆیـی ، ل ٩٧) . ((لـەیلا كۆچـی كـرد ڕووی كـردە لـەیلاخ * بـۆ تـۆ حەسرەت و بۆ من ئاخوداخ)) (پیرەمێرد ، ل ١١٤) . ((پـەی كەسـێ خاسـەن هـەوای سـەیر باخ * ماسیوای مەعشـووق نەیوش ئاخوداخ)) (مەولـەوی ، ل ١١٢) . ((بە ئـاخوداخی تۆوە شـەو تـا سـەحەر نـەدەم تل * نەختێ لـە خـوا بترسـە

ئەی چاوڕەشەی شل و مل)) ( بێکەس ، ل ١٢٦ ) ... ٢ــ ئاخوحەیف ؛ ئاخوحەسرەت ... (بـ . : ئاخ[1] ٢ــ) . تەئکید لەسەر زۆریی حەیف و ئەسەف دەکا ((لە دەست نەزانین هەزار ئاخوداخ * هێشتا تووتنمان نەبووە بە ساچاخ)) (پیرەمێرد ، ل ٢٨٠) .

**ئاخوڕ**

( ئست . : ئا ـ کوەرە ؛ پە . : ئاخوەر ) . ئاخر ؛ ئافڕ ؛ ئافەرە ؛ ئاووڕ ؛ ئاهویر ؛ ئاڵفدان ؛ ئاخۆڕ ؛ ئاخڵ ؛ ئاخڵە[2] ؛ هەڤش ... جێی خۆراکی ئاژەڵ ، کە لە قوڕ هەڵدەبەسترێ و ئالیکی بۆ تێدەکرێ . ((قوش قوشی ڕاوی نەبێ ، مورغی کولانە و ئاخوڕە * سەگ سەگی تازی نەبێ ، کادینیی‌یو ئەنبارییە)) (نالی ، ل ٥٨) . ((مەیتەر و زین و تەویلە ، ئەی برا ، لازم نی‌یە * ئاخوڕ و ڕەشمە و لغاوی هەروەها پێویست نی‌یە)) (بێکەس ، ل ٢٢١) . ((وڵاتی ئێمە زۆر کوێستانە . ساڵی وا هەیە پێنج مانگ بەفر عەرز بەرنادا و حەیوان و ئاژەڵ لەسەر ئاخوڕ و دانگەیە)) (هێمن ، ل ٤١) . ((ئەسپی کێشایە سەر ئاخوڕ)) (ئەفسانە ، ل ١٧) . ((تەویلەکانی خاوێن دەکردنەوە ، کلۆ خوێی گەورە گەورەی لە پێش ئاخوڕەکان دادەنا ...)) (هەتاو ، ل ٤٤) . ◊ ئاخوڕی بەرزە - بە یەکێك دەوترێ لووت بەرز و بە فیز بێت ... ئاخوڕی خوارە - ١ــ بە

کەسێکی دەستبڕ و تەڵەکەباز و ناپاک دەوترێ : ٢- کاری چەوت و چەوێڵ و چەواشە : ٣- مرۆی دووڕوو و دووزمان ... ئاخوڕی خۆی لێتێک چووە - لە خۆی بایی بووە : لە خۆی گۆڕاوە ... ئاخوڕی چەورە - بە کەسێک دەوترێ سامانداری و تێروتەسەل و سایە چەور بێت .

**ئاخون[1]**

( بـ . : ئاخوند ) . (( لە گوێ مەگرن قسەی ئاخونی سونی * بە ئاشووبن مەلای سەر لنگە دەستاڕ)) (شێخ ڕەزا ، ل ٢٢) .

**ئاخون[2]**

(بـ . : نینۆک : ناخون) .

**ئاخوند**

(ن . ، نس . : ئا ((پێشگر)) + خوند)) لە خواوەند یان خوێندن بووەوە) . ئاخون[1] : ئاخۆند : ئاخوون : ئاخووند ... ١- مەلای شیعە : مەلای عەجەم . ٢- مرۆڤی خواناس و خواپەرست . ٣- ئادەمیزادی خوێندەوار . ٤- مامۆستا و ڕاوێژکار ... ((ئێرە وڵاتی کوردانە ، شای ئێران چ کاری بەسەر ئەم وڵاتەوەیە و ئاخوندی لە بۆچی بۆ دەنێرێ ! چما نازانێ ئێمە سوننین و مەلای کوردمان دەوێ ، نەک ئاخوندی عەجەمان)) (دمدم ، ل ٥٢) . ((مزگەوتەکە دوو ساڵ دەبوو بینانرابوو ، بەڵام هێشتا هەر بێ مەلا بوو ،

پێش نوێژی نەبوو . زۆر جاران ئاخوند دەهاتنە کنە خانۆ کە بە بەر نوێژیان قەبووڵ بکا ، بەلاّم ڕازی نەدەبوو . جارێکی ئاخوندێك لە کەربەلاوە هات ، نێوی مەمەد عەلی بوو ...)) (دمدم ، ل ٥١) . ((ماموّستا و ئاخوند دهاتن جەم وی ...)) (کوردۆ ، ل ١٦٠) . ((... واتا ژێرا ئاخوند و سەیدا گرتبوون)) (کوردۆ ، ل ١٥٥) . ((ئاخوندێك بە ورگی زەلام و چاوێکی هەڵساوەوە لە لای سەرەوەی ژوورەکە دانیشتبوو)) (هەتاو ، ل ٤٣) .

**ئاخوواخ**

(ئـ . ، نس . : ئاخ + و + واخ) . ( بـ : ئاخوداخ) .

**ئاخۆ[1]**

(ئپر . ، نس . : ئا + خۆ) . ئاخوا : داخۆ : داخوا : داخودا : ئایا : ئایاکو : ئایەکو ... (بـ . : ئا[7]) . بە واتای (تۆ بڵێی : تۆ بێژی) دێت : ((دوکاندارەکان کە دیتیان ، گوتیان دەك بەخێر نەیێت ، ئاخۆ دیسان چ بڵێ ؟ )) ( دمدم ، ل ٢٩) . ((تۆ لە جیهانێکی وادا ئەژیای ئاگاداری ئەوە نەبووی ، کە ئاخۆ کەس سەیرت ئەکات یان نا ؟)) (مستەفا ، ل ١٢٩) . ((بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ چاوی لە چۆنیەتی من بووە ؟)) (مەم[1] ، ل ٢٠) . ((بڕوانم ئاخۆ جامی فتوغراف * نیشانم نادات شێوەی ئێڵی جاف)) (پیرەمێرد ، ل ١٢٥) . (( هەموو بە عەزرەتەوەن گوڵ فڕێدەنە بەر پێت * خوایە ئاخۆ گوڵی کی بە دڵتەوە

ئـەلكێت ؟ )) ( گـۆران ، ل ٦٠ ) . (( بـە فكرێكـە كـە ئەم خوونرێـژە شیری بەستە پشت ئـەمڕۆ * لـە ئەستۆ دانی كێیە ؟ كێ دەكا ئاخۆ كەمەربەستە ؟!)) (مەحوی ، ل ٢٦٥) . ((ئاخۆ بە چ شاخێكەوە گیرساوە دڵی من یاخۆ بە چ داخێكەوە سووتاوە دڵی من)) (بێخود ، ل ٦٦) .

**ئاخۆ[٢]**

(ئ . ) . ( هـ . ) . (بـ . : ئاخوداخ) . ((چەتۆ ئاخ و خەمۆ من پەی نیشانێ * سیواو ئاخۆ ، نیۆ هیچ دەستەڵاتم)) (صەیدی ، ل ١٤) .

**ئاخۆتك**

(كڗ .) . (ن .) . (دم .) . (بـ . : ئاخاوك) .

**ئاخۆران**

١ـ ئاژاوە : ئاشووب : ئاشەڤ : پشێوی : شێواوی : شپرزەیی : شڵەژان : قەومان : هەراوبگر : هـەراوهوریا : ڕوومەڵخەزا : ڕوومەڵفەزا ... كێشە و هەرا و ئاژاوە . ٢ـ تاووتۆف : باهۆز : هوڕەبا : زریان : كرێوە . ئەم وشەیە بـە تـەنیا بەكارنایـەت و لەگـەڵ (بـاخۆران : بخـۆران : زاخـۆران) دێـت . (بـ . : ئـاخۆران بـاخۆران : ئـاخۆران بخۆران : ئاخۆران زاخۆران : ئاخۆران وبخۆران) .

**ئاخۆران باخۆران**

(بـ . : ئاخۆران : ئاخۆران وبخۆران) .

**ئاخۆران بخۆران**

(بـ . : ئاخۆران : ئاخۆران وبخۆران) .

**ئاخۆران زاخۆران**

(بـ . : ئاخۆران : ئاخۆران وبخۆران) .

**ئاخۆران وبخۆران**

ئاخۆران باخۆران : ئاخۆران بخۆران : ئاخۆران زاخۆران . ( بـ : ئاخۆران ) . ١. ئاژاوه و پشێوی ... ئاخۆران وبخۆرانێکە سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە . ٢- شپرزەیی و هەراوبگر و نائارامی ((... بەر لەوەی چەند هەنگاوێ بەسەربەستی هەڵبنێ شریخ و هووڕی شەستیر هەموو گیانی هێنایە لەرزین ، نەك لە ترسا ، زۆرتری لە شپرزەیی و ناچاریدا ... کەی ئێستا کاتی بە شوێن خەڵکا گەڕانە ، ئەگەر ناچاری نەبێ ؟ دوور نییە بەم ئاخۆران وبخۆرانە باجی پیرۆزیش لەگەڵی نەیەت ...)) (ژانی گەل ، ل ١٧) . ٣- تێکچوون و و هیچ بەسەر هیچەوە نەمان . ٤- خۆخۆیی و ئاگا لەیەکتر نەمان . ٥- کۆمەڵی دز و تالآنچی : ∴ ئەو ئاخۆران وبخۆرانە هیچیان پێ نەهێشتین .

**ئاخۆڕ**

(بـ . : ئاخوڕ) . ((چەتا حوکومەتێ ژ بەر مالا سەیدۆ دڕەڤن دکەڤمە پانگا و ئاخۆڕا قولێ کادینا)) (ستران ، ل ٦٨) .

**ئاخۆند**

(کژ.) . (بـ . : ئاخوند) .

**ئاخوون**

(بـ . : ئاخوند) .

**ئاخووند**

(ب. : ئـاخۆند) . ((چـاڤێ کـورك دەه سـالی بـوون زلام پەری دان ئاخووندا کو ئەو وانا هینێ خوەندنێ و هونەرێ شەڕ بکـن . ئـاخووندا ئـەو هینـێ هـەموو دوانـزدە عیلمـا کرن)) (کوردۆ ، ل ٥٧) .

**ئاخ هەڵڕشتن**

(چ . ، نـس . : ئـاخ + هـەڵ + ڕشـتن) . دەربڕیـن و خستنەڕووی خەم و خەفەت ، یاخود حەیف و ئەسەف . ((کـەی لێو تـەڕ ئـەبێ بـە ئـاخ هەڵڕشـتن * کـەی تـەزووی ئۆخەی ئەگا بە ناخم)) (دیلان ، ل ٧٥) .

**ئاخ هەڵکێش**

(نـك . ، نس . : ئـاخ[١] + هـەڵ + کێـش ((کێشـان)) ) . ئاخکێش ؛ هەناسەهەڵکێش ... بە کەسێك دەوترێ لـەتاو خەم و ناخۆشی ئاخ و ئاهی بێ . یـەکێك ئـاخ هەڵکێشـێ و خەفەتباربێت .

**ئاخ هەڵکێشان**

(چ . ، نس . : ئاخ[1] + هەڵ + کێش ((کێشان)) ) . ئاخ کێشان : ئاخ هەڵکێشان : ئاخین : ئاخین وداخین ... هەناسەهەڵکێشانی تێکەڵ بە کڕووزانەوە و پاڕانەوەی زەلیلانە . ئاخ وداخ وتن لەتاو خەم ؛ یان نەفەسی پەژارە و ماتەمی . ((ماڵ لە مەریوان ، دڵ لە دەرویشان * مردن خۆشترە لە ئاخ هەڵکێشان)) (زامدار ، ل ٦٢) . ((ئەیڕشت لە فرمێسك لافاوێ * ئاخی‌هەڵکێشا تاوێ * بە یادی باڵا لاولاوێ)) (گۆران ، ل ٢٢) . ((مامە ئاخێکی هەڵکێشا بە تەوێڵی خۆیا کێشا)) (دیلان ، ل ٥٢) .

**ئاخی**

(بـ . : یاخی) .

**ئاخیە**

(ن .) . ١ـ ئارنج ؛ ئارێخ ؛ گوڵمێخ ؛ گولمیخ ؛ سنگ ... سنگی ئاسنی ئەڵقەدار ، یان سنگی ئەستووری دارین ، کە لەبەر ئاخوڕدا ولاخی پێوە دەبەسترێتەوە . ٢ـ مەڕبەند ؛ مێخ زنجیر ... سنگ و زنجیر بۆ بەستنەوەی یەکسم .

**ئاخیر**

(بـ . : ئاخر[1]) . ((ئەوەڵلی هەر حەسرەتە ئاخیری هەر نیعمەتە)) (میهری ، ل ٦٥) . ~ ی کار – ئەنجامی کار ؛ کۆتایی کار .

**ئاخیرەت**

ئاخرەت ؛ ئەزەل ؛ ڕۆژی قیامەت ؛ ڕۆژی حەشر ؛ ڕۆژی جەزا ؛ ئەو دنیا ؛ پەسلاّن ؛ سەلاّ ... ڕۆژی هەڵستانەوەی پاش مەرگ . ((ئەگەر نەیدەیتە دەست خۆم قاتیلی خۆم * لە ڕۆژی ئاخیرەتدا بی پیناوم)) (نالی ، ل ۲۹۳) . (( کە تۆ ڕەحمەت نەبیٚ بۆ بێکەسێکی وەك منی ( مەدهۆش ) * لە ڕۆژی ئاخیرەتدا لای خودا جوابت ئەبیٚ چی بیٚ )) ( مەدهۆش ، ل ١٥ ) . (( لە دنیا تا دەگاتە ئاخیرەت کاریگەرە تیری * وەکوو تیری تەهەمتەن زامی پاك ئەمدیو و ئەودیوە)) (مەحوی ، ل ۲۸۸) .

**ئاخیری**

(بـ . : ئاخری) . ((میسلی ئێوە پاڵیان دا بە دوعا * ئاخیری کافر بە پیشیاندا ڕیا)) (کۆیی ، ل ۲۰۲) .

**ئاخیرین**

(بـ . : ئاخرین) .

**ئاخین**

(بـ . : ئاخ هەڵکێشان) . ((چەند ژنیٚ سەرە گریان ، کرنە ئاخین * حەیفا خوە گەلە ل سیابەند ئانین)) (چریکە ، ل ٥١) . (( قەت تو ناهێی ئاخینا دلا * پیریٚ بەر گوتنیٚ وی تەعەمول نەدا * کرە ئاخین و کوڕێن کەتیٚ گریا)) (چریکە ، ل ۳۰) .

**ئاخینك**

(ئـ . ) . ئاخوداخ : ئـاخوئۆف ...(( ده ئیرۆ ئـاخنین و ئوفینكێـت مـن و بـەژنا بلنـد گرانـن ماینـه ل سـەرتێك دلـۆ ، دلـۆ ، فەلـەكا مـن خـانیێ )) ( بامـەرنی ، ل ١٥٨ ــ ١٥٩ ) .

**ئاخین وداخین**

(ل .) . ئاخوداخ هەڵكێشـان ... (بـ . : ئاخ هەڵكێشـان) ؛ ئاخین) .

**ئاخێز**

( ن . ، نس . : ئا + خێز ) . ١ـ جووڵه ؛ جـم ؛ بـزاڤ ؛ بزاو ؛ تەكان ... نیوەهەڵستان ـ واته له حاڵەتێكدا كەسێك دانیشـتبێ و وا نیشـان بـدا دەیـەوێ هەڵبسـتێ ، بـەڵام هەڵناستێ و كـەمێك لـه جێـی خـۆی دەجووڵـێ ؛ ∴ بـەو ئاخێزە دەتەوێ نیشانی بدەی لەبەر مامۆستا هەڵستای . ٢ـ هەڵستان ؛ هەستان ...ی تـەواو : ((بانوو ئێد شنەفت نه جا كەرد ئاخێز * بۆ سا پای سەیر ئەو ڕەنگ پەروێز)) (خانـای قوبـادی ، ل ١٤١) . ٣ــ ڕاپـەڕین ؛ شــۆڕش ؛ هەڵمەت ... ((ئاخێزا سەردار شێر سـەنگین سام * كـەرد بـه سێ حیصصه سوپای وێـش تـەمام)) (هەمـەوەند ، ل ٣٢٥) .

**ئاخێزكردن**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئا + خێز + کردن) . ١ـ جوولأن ؛ بزووتن ؛ بزاوتن ؛ جمان ؛ تەکاندن ... .. کاتێ ماموستا چووە ژوورێ ، ئازاد بەتەواوی هەڵنەستا و هەر ئاخێزێکی کرد . ٢ـ پەلەکردن ؛ زووکردن ؛ لەزکرن ؛ گورج کردنەوە ... ((دووریسان ئایر نەجەرگم وەردان * شەماڵ ئاخێزکەر دەخیل هامەردان)) ((میرزا ئولقادر ، ل ٧٠) .

**ئاخێوەر**

(نك . ، نس . : ئاخێو ((ئاخێوتن)) + ەر) .

(بـ . : قسەکەر) .

**ئاخێوتن**

(بـ . : ئاخافتن) .

**ئاد**[١]

(جکـج .) . (هـ .) . لـە ناوچـەی هـەورامان و هـەندێ شوێنی دی کوردستان بە واتای (ئەو - بۆ نێرینە) دێت . (بـ . : ئەو ؛ ئادە) . ((ئاد مارۆ بەویر ئەرزەکەی بالأت * ئەو دیدەی مەستت ، ئێد خاڵ ئالأت)) (مەولەوی ، ل ٢٣٥) . ((ماوای ڕەفیقیش جە کۆی توون بێ * ئادیچ[١] چوون مەجنوون دەروون پڕ هوون بێ)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ٢٢٤) . ((ئاد دەماخ دڵ پەرداخ کەردەوە * ئێد سۆز یاران هەم ئاوەردەوە)) (جەفایی ، ل ٧٣) ... پـ . : ئاد سوار و من پیادە - ئەو سوار و من پیادە . ئاد

---

(١) ئادیچ - ئەویش

کاروانچی و من خانچی - ئەو کاروانچی و من خانچی ... ئەو + ان ⟵ ئەوان (هـ . : ئاد + یشا ⟵ ئادیشا - ئست . : ئەیشام) .

### ئاد[2]

(ع . : عهد) . (کژ .) . (ن .) . ١- بەڵێن : پەیمان : گفت : سۆز ... ((عەمەر بهیست شکالەمێرا * ئاو و قەراریٚ جاهلیٚ کوردا)) (جەلالی ، ل ٥٢) . ٢- سوێند : سووند ... ((من سۆندەك خوەرییە ، ئادەك پێرا ــ پەی ئەسەدیٚ ــ ئاغیٚ ، حەمزۆییٚ زەعڤارا گریٚ نادم کوفییا زێرا ، کل بەلەك چەعڤا)) (ستران ، ل ٤٣٧) .

### ئاد[3]

(تـ . : ئەدە ؛ فـ . : آداك) . (ن .) . ئادا : ئادە : دورگە ... (بـ . : دورگە) . ((باڤیٚ گۆت : لاوۆ ، گلی دکن ، کو ل ئۆرتا بەحریٚ ئادەك هەیە ، ل ویٚ ئادا پاشاك هەیە)) (کوردۆ ، ل ١١١) .

### ئادا[1]

(بـ . : ئاد[3])

### ئادا[2]

( ئن . ) . بەخشندە : دڵاوا : بەدڵ : سەخی : سەغی ...

× رژد : چرووك ...

### ئادا[3]

(ئن . ، ن .) . لێزان : پسپۆر ...

**ئاداب**

(ع . : كۆی ((آداب)) ، ) . ١ـ داب : نەریت ؛ دەستوور ؛ خوو ؛ ڕەوشت ؛ ئاكار ... خوو و ڕەوشت و ڕێ و شوێن و وێڵ و ماریفەتی هەڵستان و دانیشتنی ناو كۆمەڵ ((بەر دوو برمێن تە ژ ئخلاص و یەقین * م دبرە سەجدە ب ئادابی دوعا)) (جزیری ، ل ١١٠) . (( ئەسبابێ نەشات و كامەرانی * ئادابێ سەفا و زەندەگانی )) ( خانی ، ل ٣٩٠ ) . ٢ـ ئەدەبیات ... وێژە ؛ شیعر و پەخشان ... سەرجەمی كەلەپووری ئەدەبیی نەتەوەیێك . (( تاكە بوانۆ جزمێ جە قورئان * شەرت وشەرابت ، ئاداب و عیرفان)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١٢٢) . ∴ كۆلێجی ئاداب - ئەو كولییەیەی زانستگا ، كە بۆ خوێندنی ئەدەبیات تەرخان كراوە .

**ئادابزان**

(ئاداب ـ ع + زان ـ ك (زانین) . بە كەسێك دەوترێ لە داب و نەریت و ڕێ و شوێن و وێڵ و ماریفەتی پێشوازیكردنی میوانداری بزانێ .

**ئادار[1]**

(سر .) . (ن .) . بە عەرەبی (اذار)ە و لە سوریانییەوە وەریان گرتووە . ئادار ؛ هادار ؛ مارت ؛ مارس ... سێیەم مانگی ساڵی ڕۆمییە (٣١ ڕۆژە) . ((هەر ساڵێك لە ڕۆژی

جێژندا لە بیست و یەکی ئادارێدا مەجلیسی عەشیرەتی بەرۆدار لە دیوەخانی کۆدەبوونەوە ...)) (دمدم ، ل ٢٩) . ((زەینۆ دبێ : ((لێ ـ لێ ، لێ ئامۆ ، دلێ من کولیکا سەرێ ئادار وسباتێ ، فرقەك ئەسکەر ڕابوویە ژ خۆیانا دیاربەکر ...)) (ستران ، ل ٨٨) ... پـ . : ئادار ناڕۆا بەبێ دۆ ، نیسان ناڕوا بەبێ جوا . ئادارە مەشکە لە دارە . مانگی ئادارێ ، بباری هەتا گوێی دارێ ، هیچی نامێنێ هەتا ئێوارێ ...

ئادار[٢]

(بـ . : ئاتار) . ((تاریکایی زۆرداری و هەوری چڵکنی نالەباری وەها تەرت و توونا بوو ، کە ئاداری بەسەر پاداریەوە نەما)) (شەرەفنامە ، ل ١٣) . ((دەچنە سەر دارێ لە ڕۆژی ئینتیقام و تۆڵەدا ئەو کەسەی کوشتی بە ناهەق پێشەوا و سەرداری کورد * نایەڵن ئادار بەسەر پاداری ئەو دەربارەوە * چونکە دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد ، پاداری کورد)) (هێمن ، ل ١٢٤) .

ئادارۆك

(ن . ، نس . : ئادار + ۆك) . گوڵێکی کێوییە ، لە سەرەتای بەهاردا لەسەر بنی پاری شین دەبێ و دەپشکوێ ... ئەگەر ژوورێك کرمی تێدابێ ، دەسکێ لەو گوڵەی لێدادەنێن و کرم یان بە لادا دێ یان هەڵدێ ...

هەروەها دەرمانێکی چاکە بۆ ئازارشکاندن ؛ ئاداروک تەڕ دەکرێ و دەکوترێ و لەسەر شوێنی ئێش دادەنرێ .

### ئاداماخلی

(ت .) . (کس .) . (ئن .) . ڕێکوپێک ، لەباروتەکۆز ... ((زینێ ڕادبە سەرخۆ ، دەستەك جلێ ئاداماخلی خودکە ، چەعقێ خو ب کلێ سیمانی کل ددە ...)) (زارگۆتن ، ل ٨٨) .

### ئادان

( ئن . ) . ١ـ بەپیت و بەرکەت ؛ بە پیت و ڕیژەو ؛ بە پیت و فەڕ ؛ بە بڕشت ... ( زەوی ) . ٢ـ بەکەڵك ؛ سوودبەخش ؛ بە بەهرە ... مرۆڤی زۆر بە کار و کار لەدەستهاتوو . ٣ـ بەردار ؛ بەبەر ... (درەخت) .

### ئادانی[1]

(ن .) . ١ـ بەپیت و بەرەکەتی ؛ بە پیت و ڕێژەوێ ؛ بە پیت و فەڕی ؛ بە بڕشتی ... (زەوی) . ٢ـ بەکەڵکی ؛ سوودبەخشی ؛ بەبەهرەیی ... (مرۆڤ) . ٣ـ بەرداری ؛ بەبەری ... (درەخت) . (بـ . : ئادان) .

### ئادانی[2]

(ن ) . ناوی بەرەیەکە لە پێنج بەرەکەی یەزیدی . ئێزدی پێنج بەرەیە : ئادانی ؛ قاتانی ؛ پیرانی ؛ مریدی ؛ شەمسانی .

**ئادە[1]**

(جکیج .) . (هـ .) . لە ناوچەی هەورامان و هەندێ شوێنی دی کوردستان بە واتای ( ئەو ـ بۆ مێینە) دێت . (بـ . : ئەو ؛ ئاد) . ((من و قمری بهم دمساز گشتیم * هەر ئادە ، چلوە ، کۆ کوش بێ ، من ئاخ ئاخ)) (صەیدی ، ل ١١٨) . هەر ئاد - هەر ئەو .

**ئادە[2]**

(ن .) . تەڵە کەروێشك .

**ئادە[3]**

(ن .) . بژار ... کاری خاوێن کردنەوەی کشتوکاڵ و شیناوەر لە گیا و گوڵی بە زیان .

**ئادە[4]**

(بـ . : ئاد[3]) .

**ئادەبوون**

( کڕ . ) . ( چ . ، تێن ، نس . : ئادە + بوون ) . ١ـ پاك بوون ؛ خاوێن بوون ؛ پاکژبوون ؛ پاقژبوون ... ٢ـ جیابوونەوە ؛ جیاوەبوونەوە ؛ جویێبوونەوە ؛ دوورکەوتنەوە .

**ئادەت**

(ع . : عادة) . (کڕ .) . (ن .) . عادەت ؛ ڕەوشت ؛ خوو ؛ ئاکار ؛ کردەوە ... (بـ . : عادەت) . ((وان کۆت : کە کێ

ئەم تەڤ دگرین کو ئادەتا مە رابەر یەکی کرنا قۆناخان عەیبا گرانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٧٨) . ((تاکو دخوازی یش بمەشینی ل سەر ئاداتانە * زینێ بەردە و ب مەڕە ڤەگەڕە مالانە)) (مەمێ ئالان ، ل ١١٦) . ((ئادەتا وە فیزانە هوون ددن دوو خۆرتانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٥١) .

**ئادەتی**

(عك .) . (کژ .) . (ئن . ، نس . : ئادەت + ی) . ئاسایی ؛ عادەتی ... (بـ . : عادەتی) .

**ئادەر**

(ئن .) . ڕەسەن ؛ جسن ؛ کەمێل ... (بـ . : ڕەسەن) .

**ئادەکرن**

( کژ . ) . ( چ . ، تێ . ، نس . : ئادە + کرن ) . ١ـ پاككردن ؛ خاوێن کردن ؛ پاکژکردن ؛ پاقژکردن ... ٢ـ جیاکردنەوە ؛ جیاوەکردنەوە ؛ جووێکردنەوە ؛ دوورخستنەوە .

**ئادەم**

(ن .) بە (عیبریی کۆن) واتای (مرۆ ؛ مرۆڤ ؛ مەردووم ؛ ئینسان ؛ بەشەر) دەدات . بە پێی گێڕانەوەی تەورات و ئینجیل و قورئان یەکەم مرۆڤ و باوکی ڕەگەزی سەرجەمی بەشەرە : خوا ئادەم و حەوای ژنی دروست

کردووە و لە بەهەشت داینـاون . دوایـی لەسـەر نافـەرمانی فرێـی داونەتـە سـەر زەوی ... ئـەمڕۆ لـە کوردیدا ، وشـەی (ئادەم) بە دوو واتا بـەکاردێنرێ : ١ـ بابـە ئـادەم ؛ بـاوە ئادەم : ((لـە (ئادەم) بگرە تـا دەورانـی ئێستـا * یەکێکـە (حـاجی) لـەو خاکە هەڵستا)) (کۆیـی ، ل ٢٥٣) . قشقـەڵە گوتـی : کەڵـەباب و مریشـکێکم پـێ شـك دێ لـە زەمـانی حەزرەتی ئادەمیەوە ماون هـەتتا ئـەوڕۆ)) (تحفـە ، ل ١٩٥) ... ٢ـ مرۆ ؛ مرۆڤ ؛ مەردووم ؛ ئینسان ؛ بەشەر ((مەثـەلی عـەهد و وەفا وەك مەثـەلی عەنقایـە * پیاوەتی باسـی لـەکن کەس مەکە ، ئادەم بووە قات)) (مەحوی ، ل ٦٢) . ((ئـەی زولفی کەچت مایەی ئاشـووبی دوو عالـەم * وەی خـاڵی لـەبت دانـەی پابـەندی ئـادەم)) (ئـەدەب ، ل ٥٥) . ((گـۆ : ئەی سـەبەبێ فەسـادێ عالـەم * شـەیتان سـفەتێ ل شـکلێ ئادەم)) (خانی ، ل ٤١٨) ... (بـ . : ئینسان) .

**ئادەمزا**

(ن . ، نس . : ئادەم + زا) . (ئادەمیزاد : ئادەمیزا) .

**ئادەمزاد**

(ن . ، نس . : ئادەم + زاد) . (بـ . : ئادەمیزاد) . ((ئـەی خـوای گـەورە ! ئەگـەر بـە حوکمـی خوایـی * گەوهـەری ئـادەمزادت گشـت جـوان داڕشـت)) (گـۆران ، ل ٤٦٧) . ((یەکەم ئاگرێك کە ئادەمزاد چاوی پـێ کـەوتبێ ، ئاگری نێـو دەروونـی چیـای ئاگرییـە)) (ئەفسـانە ، ل ١٤٣) .

((حاجی قادر ... دەبێ ئادەمزادێکی یەکجار نەفس زل و ... باوەڕ بە خۆ هاتوو بووبێ)) (مەسعوود ، ل ١٧١) .

**ئادەمی**

(کن . ، نس . : ئادەم + ی) . نەوەی ئادەم ؛ ئەوەی لە ڕەچەڵەکی ئادەم بێ . (بـ . : ئادەمیزاد) . ((ئیتر من نە هیچ ئادەمیم ، نە نیشتمانی * نە ئەندامی ئەم کۆمەڵەم لە کوردستانی)) ( گۆران ، ل ٢٥١) . (( تەنها بریتی بوون لە تارماییەکی سپی ، بەتایبەتی پیرە بەچەشنی شێرە بەفرینەییێك نەك ئادەمیەکی شەپرزە )) ( خەندەلێو ، ل ٣٢ ) . (( ئەسبابی نگین ب بێژە کینە ؟ * جننینە ، پەرینە ، ئادەمینە)) (خانی ، ل ١٤٦) .

**ئادەمیزا**

(ن . ، نس . : ئادەم + ی + زا ((زان)) ) . (زا) – فرزەند ؛ منداڵ ؛ ڕۆڵە ... (زان) – منداڵ بوون ... (بـ . : ئادەمیزاد ؛ ئادەمزا) .

**ئادەمیزاد**

(ن . ، نس . : ئادەم + ی + زاد ((نەوە)) ) . ١- ئادەمزا ؛ ئادەمزاد ؛ ئادەمیزا ؛ بنیادەم ؛ نەوەی ئادەم ... ئەو کەسانەی لە ئادەم کەوتوونەتەوە . ((لە بەهەشتا بە یادی تۆ شادم * بە تەماشای فریشتە ئازادم * جەننەت ئەفرۆشم ئادەمیزادم * بە نیگاهێکی دیدەیی بیمار)) (پیرەمێرد ، ل ١٦٣) . ٢- (بـ . : ئادەم ٢- ) .

**ئادەی**

(ئـ . ، نـس . : ئـا + دەی) . ١ــ دەی ؛ دادەی ... ئـەم ئـامرازە بـۆ دنـەدان و هـاندانی کردنـی کـارێك ، یان وریاکردنەوەی کەسێك بـەکاردێنرێ ((ــ دە کەوایـە ، نـەیارن و ناتانگەرەکـە قسـە لا ئێمـەی کـورد بدرکێنـن ، ئادەی بیانبەن ، لە پشت ئەو کۆنـەوە بیانکوژن)) (دمدم ، ل ٣٠٢) . ((ئەگەر مەردی ئادەی شەقێ لەناو دەمی دەریا هەڵدە)) (قەرەداغی ، ل ٩) ... (بــ . : ئـا[٧]) . ٢ــ ئـا بـزانم چـۆن ... ((وتم باشـە دەڕۆیـن بـۆ ئیسـپانیا ، بـەڵام بـە مەرجێك . وتی : ـ ئادەی . ـ لە شاری (بەرشلونە) دووربین کە باوکتی تیـادا دەژی)) (کـۆردەرە ، ل ٢١٦) ... ( بــ . : ئا[٤] ) .

**ئادر**

(د .) . (ن .) . (بـ . : ئاگر) .

**ئادرەس**

(فــر . : adresse ) . (ن .) . ئــادرێس ؛ ئــەدرەس ؛ ناونیشـان ؛ عینـوان ... ناونیشـانی شـوێن و مەڵبـەندی دەزگـایێك ؛ بەڕێوەبەرێتـییێك ؛ ماڵێك ؛ دوکـانێك ... یـان جێگـە ژیانی کەسێك (( (واسیل) ئادرەسی خۆی دامـێ و گوتی : ـ هەر کاتێك بەرەڵلاّ کرای وەرە لای من کارم پێنە . ـ هەرچەند ناکرێ باوەڕ بەو بەڵێنانە بکەی کە بەندییەکان

پێکی دەدەن . بەڵام چارەم نەبوو ئادرەسەکەم لێوەرگرت))
(گێلەپیاو ، ل ١٥٦) .

**ئادرێس**

(بـ . : ئادرەس) .

**ئادکرن**

( چ . ، تیێ ، نس . : ئاد (( ع . : عهد )) + کرن )) . ١ـ
( بـ . : بەڵێن‌دان ؛ پەیمان‌دان) . ((ئو تەماما ئادکر وورا *
کـو حـەلال بـن مینـا بـرا)) ( جـەلالی ، ل ٤١ ) .
٢ـ سوێندخواردن : برا ئاد بە - سوێند دەخۆم . برا ئاد
بە ، ئەز ئیدا ناچم مالا وان - سوێند دەخۆم ، من ئیتر
هەرگیز ناچمە ماڵی ئەوان .

**ئادگار**

( ن . ) . ڕواڵـەت ؛ ڕوخسـار : شـێوە : دیمـەن ...
ڕەنگ‌وڕوخسـار ؛ شکڵ‌وشـێوە ... ئـەوەی لەبـەرچاوە :
ئادگـاری ئـەو پیـاوە زۆر ڕێك‌وپێکـە . ∴ ئـەو چیایـە بـە
ئادگار زۆر دڵگیرە .

**ئادانیێ**

( کڕ . ) . (ئا ((ئـەو)) + دن ((دیکـە ؛ دی ؛ تـر ؛ کـە (( +
یێ ) . (بـ .ئادیێ[1] ؛ ئا[8] ؛ دن) .

**ئادۆدە**

(بـ . : ئادوودە) .

**ئادوودە**

(کژ . ) (ن .) . ئادۆدە . قامیش یان داری درێژ ، کە بنمیچی ماڵی پێ پاك دەکرێتەوە .

**ئادی[1]**

(ئنند . ، نس . : ئا ((ئەو)) + دی ((دیکە ؛ تر ؛ کە ؛ دن)) . ئەوی دی ؛ ئەوی دیکە ؛ ئەوی تر ؛ ئەوی کە ؛ ئادنێ . (بـ . : ئا[8] ؛ دی) .

**ئادی[2]**

(ئـ ) . ئا ؛ ئەدی ؛ ئارێ ؛ ئەرێ ؛ هەرێ ؛ با ؛ بەڵێ ... (بـ . : ئا[2] ؛ بەڵێ) .

**ئادیوبۆدی**

١. چاووڕاو ؛ شاتۆشوت ؛ دڕۆهەڵبەستە ...
٢ـ خۆهەڵکێشان و بافیش ؛ لافوگەزاف ؛ درۆودەلەسە ...
٣ـ زۆر گوتنی بێ بەهرە ... ٤ـ بڵاوکردنەوەی درۆی زل .

**ئار[1]**

(ن .) (بـ . : ئاگر) . ((فەلەکێ مال ئار بوویی * کە سووگان ستوخارکر)) (کوردۆ ، ل ٢٦٠) . ((مەمێ گۆت : برا ، دلێ من ژ کول و کەسەران وسا تژییە وێ ب ژانە * ژ دلێ من ئارێ خەفت فرنانە)) (مەمێ ئالان ، ل ٨٨) . ((ئەگەر بە ئاری عەشقەکەت دولبەر بسووتێم دوور نییە *

چونکە وەك پەروانــە قوربـان مـن پەشـێو ئـەحوالّی تـۆم))
(مینە جاف ، ل ٢٨٥) .

ئار[٢]

(کرژ .) . (ن .) . (بـ . : ئارد) . ((ئاشڤانچی گۆت : جـی هەیە ، لێ نان ل جـەم مـن تونە ، ل ڤـرا بوویـە خـەلایی ، کەسـەك نـان نایینـە ، ناهێرە ، ئارێ من تونە ، کو ژ تـەرا نانەکی بپێژم)) (کـوردۆ ، ل ٨٩) . ~ ێ گـەنم ... ~ ێ جەھ ... ~ ێ بـ کەپەك ...

ئار[٣]

(ع . : عـار) . (کـرژ .) . (ن .) . ((شـکاند سـۆندا خــوە و ناڤێ خوەکر دەفتەرا دەرەوینانـە * د نـاڤ خـەلّکی دە ، ب مە ڤەنەھشت ئار و فـەدی ئاڤا ڕوویانـە)) (مـەمێ ئالان ، ل ١٠٤) . (بـ . : شەرم) .

ئار[٤]

(ن .) . نـزار ؛ نسـار ؛ نسـێ ؛ سـێبەر ... جێگـەیێك لـە بەرزیی شاخ و کێودا ، کە بەر سێبەر و هەتاو کـەم لێـی دەدا ... شوێنێك کە هەتاو نایگرێتەوە .

ئارا[١]

١ـ نێوان ؛ بەین ؛ مابەین ... ((ئەوەی دامنا و بە هیـوای بووم ؛ لە بیری کۆنی گـەنجیدا * ئـەوەی هێزی خـەیالاتم ،

دروستی کرد له ئارادا)) (ئیحسان ، ل ٧) . ٢- ئاوان ... ((-لەوە زیاتر هەیە کە بووبێت بە سیان . - نەخێر سیان هەر لە ئارادا نییە)) (بێگەرد ، ل ٢٥) . ٣- مەیدان ... ((ئەم قەڵەباڵغی‌یە هێز نییە بەری بگرێ . هەرچی هۆردوو و قۆشەن و لەشکری دنیا هەن خڕکرێنەوە دەرۆستیان نایەن . ئەمانە ئەگەر بێنە ئاراوە پێشیان ناگیرێ . چارەییێك کورینە ، بۆ ئەوەی نەیەنە ئاراوە)) ( ئەفسانە ، ل ١٥٢ ) . ٤- بوون ؛ وجوود ... (( ... هونەرمەندان ... بورجی تەرز و بەرز و پتە و گورجی دژی پژدی سەربهوردی کەوناریان بۆ هاوردووینە ئاراوە ... )) ( شەرەفنامە ، ل ٦٣٥ ) . ٥- مەڵبەند ؛ جێگەی ژینی هەمیشەیی .

ئارا[٢]

(ف . : آراستن) . ڕازاندنەوە ؛ جوان کردن ؛ ڕێك خستن ... ئارایش ؛ ڕازاوە ؛ ڕێك وپێك ... تەخت ~- تەخت ڕازێنەوە ((تا (سولەیمانان) نەبوونە صەدری تەختی ئاخیرەت * (ئەحمەدی موختار)ی ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبوو)) (نالی ، ل ٣٧٢) . چەمەن ~ - چەمەن ڕازێنەوە ((تا نەگریا ئاسمان و ، تەم ولاتی دانەگرت * گوڵ چەمەن ئارا نەبوو ، هەم لێوی غونچە وا نەبوو)) (نالی ، ل ٣١٧) . ((غونچەی سەحەر ئەگەر چەمەن ئارایە قەت نەبوون * بۆ نیم خەندە و نازی گوڵنازی ئەو شەوەت)) (ئەدەب ، ل

٢٣) . شەو ~ ((من و یەك لەحظە شەو ئارام و تاقەت * لە دووری ماهی شەو ئارا ؟ فەرموو)) (وەفایی ، ل ١٠٨) .
بەزم ~ (( من چۆن پەروانان هەر جانفدای تۆم * حەیران جەمین بەزم ئارای تۆم )) ( وەلیی دێوانە ، ل ٧٤ ) .
جەمال ~ (( شرینە غالبی حوسنێ * ب نیشانا جەمال ئارا )) (جزیری ، ل ٥٥١) ... (بـ . : ئارایی) .

**ئارا[٣]**

(بـ . : ئاڕا[٢])

**ئارا[٤]**

(د .) . ئەو جار

**ئاراسە**

(ل.) . (بـ . : ئاراستە) .

**ئاراسەبوون**

(ل .) . (بـ . : ئاراستەبوون) .

**ئاراسەکردن**

(ل .) . (بـ . : ئاراستەکردن) .

**ئاراستە[١]**

(ئنب .) . ئاڕاستە ، ئاراسە . ( پـهـ . : ئاراستەك ) .
چاوگەکەشی ( ئاراستەن )ە و لە کوردیدا بووە بە

(ڕازاندنەوە) . ١ـ خەملاو ؛ جوانکراو ؛ ڕازاوە ؛ ئارایش کراو ... ٢ـ تەکوزکراو ؛ ڕێکوپێک کراو ؛ لەبار ... ٣ـ بە سەروبەر ؛ ئامادەکراو ؛ سازکراو ؛ ڕێکخراو (سوپا و ئۆردوو و لەشکر) . ٤ـ ئامادە ؛ دەردەست ؛ ساز ؛ تەیار ؛ حازر ...

**ئاراستە**[٢]

(بـ . : ڕووبەڕوو) . ((ئاراستەی قەدیم یەد قودرەتم * نەزدیك وە لیقای زات وەحدەتم)) (میرزا ئولقادر ، ل ١٧١) .

**ئارستەبوون**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارستە + بوون) . ئاڕاستەبوون ؛ ئاراسەبوون ؛ ڕوولێبوون ؛ بەرانبەر بوون ؛ ڕووی شتێك بەرەو شتێکی دی یان کەسێك بوون ... (( گوێم عەزرەتی ترپەی پێتە * هەمیشە ئاراستەی ڕێتە )) (گۆران ، ل ٢٠٥) . ((خۆشیی لەو دەست و مەچەکەی پۆلای ئاراستەی دوژمنە * خوێنی تێکەڵ بە خۆڵ ئەکا ، لاشەی خڵتان ، ناوی ونە !)) (ئیحسان ، ل ٦٥) . ((مژدەبێ لە تەوژمی شەپۆلەکان دەربازبووین ، ئاوکشانەوەش لەگەڵ بایەکدا ڕووە و پێچەوانەیە بۆ ناوچەییەکی دی ، کە گەڕاشەوە وێکڕا ئاراستەدەبن ، ئەوسا مەترسی نامێنێ)) (خەندەلێو ، ل ١٥) .

**ئاراستەكردن**

(چ . ، تیّ . ، نس . : ئاراستە + كردن) . ئاڕاستەكردن ؛ ئاراسـەكردن ... ١ـ ڕووتیّكـردن ؛ ڕووڵیّكـردن ؛ بەرانبـەركردن ؛ تیّگرتـن ؛ حەواڵـەكردن ؛ ڕووی شـتێك بـەرەو شتێكی دی یـان كەسێك كـردن ، وەك : أ) چـەك ؛ شـەق ؛ بەرد ... ((دیـی كابرای ژەندەرمـە لوولـەی تفـەنگی ئاراسـتەی ئـەم كـردووە)) (ژانـی گـەل ، ل ١٩) . ∴ ئـازاد شـەقێكی مـزری ئاراسـتەی دزەكـە كـرد . ب) خـەبات ؛ تێكۆشـان ... ∴ تێدەكۆشـین و خەباتمـان ئاراسـتەی دوژمنمان دەكەین . ج) توانج ؛ پلار ؛ تۆمەت ؛ قسـە . ∴ دوژمـن بیّویژدانانـە تۆمـەتمان ئاراسـتە دەكـات . ناحـەز بیّوچان خـەریكی ئاراسـتەكردنی توانـج و پـلارە ( بـ . : ئاڕاسـتەكردن ١ـ ) . ٢ـ ڕابـەریكردن ؛ ڕیّنیشـاندان ؛ ئامۆژگاریكردن ؛ نیشاندانی ڕێگای كارێك بە یەكێك یان كۆمـەڵێك . ∴ پێشـەوا بـە بیری پێشـكەوتووانە كـوردی ئاراستە دەكرد . (بـ . : ئاراستەكردن ٢ـ) .

**ئاراڤ**

(كژ .) . (ن . ، نس . : ئار + ئاڤ) . (بـ . : ئاراو) .

**ئاراڤتن**

( كـژ . ) . لەئاوهەڵكێشـان . كـاری لـە ئـاودا خـاوێنكردنـەوەی جلوبەرگ لـە كـەفاو و سـابووناو دوای لێبوونەوەی لە شتنی .

**ئاراگێل**

ئاواره ؛ عەودالْ ؛ تەره ؛ هەڵوەدا ... (ب . : ئاواره) .
((دایم نه خەیالْ ، حالْی کوردانەن * بۆیه ئاراگێل خاکی ئێرانەن)) (ئەحمەد موختار ، ل ١٨٦) .

**ئارام**

(ئست . : ئارەم - ئا ((پێشگر بۆ تەئکید)) + رەم ((قەدی چاوگ : حەسانەوه)) ) ؛ (سس . : رامەیەتی) ؛ (ف . : آرام) . ١ـ ئارم ؛ ئۆخـژن ؛ ئۆقره ؛ ئیسراحەت ؛ رەحەتی ؛ ئاسوودەیی ؛ سروەت ؛ سرفت ؛ سەبر ؛ حەوسەڵه ؛ هەدا ؛ هێساتی ... ((نییه ئارام و ڕاحەتی و خەوتن * شەو و ڕۆژێ هەتا دروستی دەکەن)) (کۆیی ، ل ٢٢٧) . ((دایك دای ڕەنج ، بۆ منالْ دای * بۆ بزەی ناو بێشکەی ئارام)) (گۆران ، ل ٣٢٦) . ((پەنجەکانت وەکو تیخی ڕقێکی سوور * داچۆڕانده دڵەی ئارام)) (قوباد ، ل ٤٩) . ((نه خواب و نه خۆر ، نه سەبر و ئارام * مەنیشتن به شاد مەکەردن کەلام)) (لەیلێ و مەجنوون ، ل ١١٣) . ٢ـ توان ؛ توانست ؛ تابشت ؛ تاوشت ؛ تاقەت ؛ وزه ؛ هێز ... ((ئای پیرۆت که چوار سالْ * ڕێگەکەی درێژه و ، هەر شەوەی * چقڵێکه و... له ئارام ئەچەقن)) (ئاسك ، ل ٣٢) . ((بەڵێ ژینیش نەما تامی که دەرکەوت تاڵیی ئەنجامی * دڵی پڕ کرد له گریه و زار ؛ نەما تینایی ئارامی)) (ئیحسان ، ل ٧) . ٣ـ لەسەرخۆ ؛ هێمن ؛ هێدی ؛ هێور ؛ بەپشوو ؛ بەحەوسەڵه ؛ نەفەس درێژ ؛ سەنگین ؛ گران ...

((... ژیانی خۆشی ژن و مێردایەتیمان زیاتر ئەو پێکیهێنابوو ، چونکە من دەزانم ... تووڕە و ... جینگنۆکەم ، بەڵام ئەو هێدی و ئارام و ژێر بوو ...)) (هێمن ، ل ٢٦) . (( یاخوا سەبووری وە دڵ باوەڕی * خەزانەی ئارام پێم عەتاکەی )) ( مەولەوی ، ل ٣٧ ) . ٤ـ خامۆش ؛ کڕ ؛ کپ ؛ مەند ؛ بێجووڵە ؛ بێدەنگ ؛ مات و بێدەنگ ؛ کشومات ؛ بێتەقەوڕەقە ؛ بێشەپۆشۆڕ ؛ بێبگرەوبەردە ؛ بێقرەوبڕە ؛ بێهەستوخوست ... (( نە ساڵ و نە ماه ، نە هەفتە نە شەو * نە ساڵێ ئارام ، نە دەقیقە خەو)) (مەولەوی ، ل ١٧) . ((باسی باوکی مەکە ئارامی نییە ئەو تەرەسە ڕۆژێ جاسووسە بە شەو تا سبەینێ عەسەسە)) (کۆیی ، ل ١١٤) . ٥ـ بەئەسپایی ؛ بەشێنەیی ؛ بەهێواشی ؛ بەیەواشی ؛ بەنەرمی ؛ بەکاوەخۆ ؛ لەسەرخۆیی ... ((بە لار و لەنجە هات بە لامەوە * بێ پەروا دانیشت بە ئارامەوە)) (پیرەمێرد ، ل ٢٩٧) . ~ ی دڵ (( چاو ؛ هێلانەی ئارامی دڵ * پەنجەی ناسك ، دەسی وەك گوڵ )) ( کامەران ، ل ٤٩ ) . ~ ی گیان (( وەرە ڕۆحەکەم ، ئارامی گیانم * وا ئەمرم لەتاو دووری و تەنیایی )) ( ئەخۆل ، ل ١٣ ) ... دڵ ~ ؛ شەو ~ ((ماهی شەوئارام بە خەندە هات نیقابی کردەوە* ئاسمان نەظمی (ثریا) شەوقی مەهتابی شکا)) (وەفایی ، ل ١٤) .

ئارامەندە

١ـ بێدەنگ : ئۆقرەگرتوو : کپ بوو : ئۆقرە و ئارام گرتوو ... ((جه شەو ئیشنەین شەشش ماندە بی عالەم گشت جه خاو ئارامەندە بی)) (هەمەوەند ، ل ٦٤) .

ئارام بوون

(چ . ، تێن ، نس . : ئارام + بوون) . ١ـ ئۆخژن هاتن : ئۆقرەگرتن : ئیسراحەت کردن : ئاسوودەبوون : سرووەت گرتن : سرەفت گرتن : سەبرگرتن : هەدادان ... کەم بوون و شکانی ژانی برین یان دامرکان و نەمانی ئێش و ئازاری نەخۆشی . ٢ـ توانین : توانستن : تاقەت گرتن : خۆڕاگرتن : لەوزەدابوون : خۆڕاگرتن و هێز بەخۆدان ... ٣ـ هێمن بوون : هێدی بوون : هێوربوون ... سست بوون یان بێهێزبوون یان نەمانی گریان و لاواندنەوە و کڕووزانەوە ... ٤ـ خامۆش بوون : کڕبوون : کپ بوون : مەندبوون : بێدەنگ بوون : مات بوون : مات و بێدەنگ بوون : کشومات بوون ... تەواوبوونی قرە و بڕە و شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە ... ٥ـ لەجووڵەکەوتن : داسەکنان : سەکنین ... نەمانی بزووتنەوە و گوێپێنەدان ... ٦ـ دابین بوون : دامرکان ... کزبوونی کەفوکوڵی ڕق و تووڕەیی : (( ... ئەویش ئارام دەبێ و جگەرەیێك بە لێوێوە دەنێ)) (ڕەئووف ، ل ٦٠) .

**ئارام بوونەوە**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارام + بوون + ەوە ) . ١ـ هێمن بوونـەوە ؛ هێدیبوونـەوە ؛ هێوربوونـەوە ... شـتێك یـان کەسێکی هێمن کە دەشێوێ و سەرلەنوێ دێتـەوە دۆخـی ئـارامی پێشـووی ... هاتنـەوە دۆخـی هێمنـی ... ٢. خـامۆش بوونـەوە ؛ کڕبوونـەوە ؛ کـپ بوونـەوە ؛ کشومات بوونەوە ... کاتێ شوێنێکی بە ئاسایش شەڕ و هـەرای تێدا دەقـەومێ و پاشـان ئاژاوەکـە دەبڕێتـەوە و دێتەوە باری جارانی ... بڕانەوەی شەڕ و شۆڕ و هـەرا و قڕە و بڕە ... ٣ـ دامرکانـەوە ... نیشـتنەوەی کـەفوکوڵی ڕق و تووڕەیی ...

**ئارامکردن**

( چ . ، کـێ . ، نـس . : ئـارام + کـردن ) . ( بـ . : هێدیکردن ) . ١ـ هێمن کردن ؛ هێدیکردن ؛ هێورکردن ... هێنانە دۆخی هێمنی ... ٢ـ خـامۆش کـردن ؛ کڕکـردن ؛ کپ کردن ؛ کشومات کردن... بەربەست کردنی شەڕوشۆڕ و هەرا و قڕەوبڕە ... ٣ـ دامرکاندن ... نەهێشتنی کەفوکوڵی ڕق و تووڕەیی ... ٤ـ ئۆقرەپێگرتن ... ٥ـ داسەکناندن ... ئێش و ئازار نەهێشتن ...

**ئارامکردنەوە**

( چ . ، تـێ . ، نـس . : ئـارام + کـردن + ەوە ) . ١ـ هێمـن کردنـەوە ؛ هێدیکردنـەوە ؛ هێورکردنـەوە ...

هێنانـەوە دۆخـی هێمنـی ... ٢ــ خـامۆش کردنـەوە ؛ کڕکردنـەوە ؛ کـپ کردنـەوە ؛ کشـومات کردنـەوە ... بڕاندنـەوەی شەپۆشـۆڕ و هـەرا و قرەوبـڕە ... ٣. دامرکاندنـەوە ... کوژاندنـەوە و سـاردکردنەوەی کەفوکوڵی ڕق و توورەیی ...

### ئارامگا

(ن . ، نس . : ئارام + گا ) . ١ــ خامۆشـگا ... شـوێنی مەند و بێدەنگ و بێکێشە و بەرە : ((خوایە لە نەبوو بۆ هێناتمە بوو * وەکو هێنامت بۆ کردمت زەبوون * ئەی بە زەبوونـی مـانم تـا سـەر بـۆ * بـۆ نامبەیتـەوە ئارامگـای نـەبوون)) (ئـەخۆڵ ، ل ٣٨) . ٢ــ ئۆقرەگـا ؛ سـتارگا ... شوێنی حەوانەوە : ((سنگی دیجلەی تریفەی مانگ زیوین کـردوو * بۆتـە ئارامگـای ئەسـتێرەی مەسـت و مـاندوو)) (بیمـار ، ل ٢٤) . ٣ـ حەشارگە ؛ لانە ؛ هێلانە ؛ هێلین ... ((هەڵۆی سپی با تۆزێك لە ئارامگای خۆیدا بێت و منیش دەرفەتم بۆ بلوێ...)) (بەرەو لوتکە ، ل ٤) . ٤ـ تەختەبەند ؛ کـەت ؛ چارپـا ؛ چرپـا ، قەرویێڵـە ؛ قەرەوێڵـە ؛ ئـارزێل)) . تـەختی لەسـەر ؛ نوسـتن و حەوانـەوە . ٥ــ مـت . : قـەبر ؛ گۆڕ ؛ قەور ؛ گڵکۆ ؛ دەخمە ... ((هەر کە دەردی سـەرەتان پەنجـەی گیر بوو لـە خوێنـم * زانیم ئـەو ئارامگایـە وا زوو ئـەبێ بە شوێنم)) (فەللاح) ، ل ١٥١) . ((ئـەی سـەیوانگای

ئارامگـای ڕابوردوومـان پێـت سـپێررا کۆسـتی تـازەی کەونوومان)) (گۆران ، ل ٣٣٧) ... (بـ . : ئارامگە) .

ئارامگە

(ن . ، نـس . : ئـارام + گـە) . (بـ . : ئارامگـا) . (( بـە هێزی هـۆز و بـازوو ناوچـەی کفـری لـە ئارامگـەی بـەغدا دابڕیـوە و خسـتوویەتە سـەر مەڵبـەندی بابـان )) (شەرەفنامە ، ل ٥٢١) . ((دایم ئارامگەی جەرگەی یاران * جای عەیش و نیشات چەم خومارانەن)) (میرزا ئولقادر ، ل ٧٠) . ((سـەیوان مۆڵـەتی شـاعیرە ؟ * ئارامگـەمان هـەر مەزرایە)) (قەرەداغی ، ل ٧٥) .

ئارامگرتن

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارام + گرتن) . ( بـ . : ئارامبوون ٢ـ ) : ((نە دەتوانم بەسەر خەرمانەی گڕەوە * لەنگەر * نە دەتوانم ئارام بگرم)) (بیمار ، ل ١٥) . ((دە ... ئیدی تۆ ! ئارام بگرە ! خۆ منداڵ نی ؟!)) (خەندەلێو ، ل ١٤) ... (بـ . : ئارامبوون ٤ـ) : ((شنە نەبزێوی سەری بسکی ڕەشی * کە لەسەر ڕوومەتی ئارامی گرت * گوێمەدە ئەو قسە کۆنـەی کە دەڵێ * لەشکری کافرە ئیسلامی گـرت)) ( هێمـن ، ل ٢٣١ ) ... ( بـ . : ئـارامبـوون ٥ـ ) : (( لـە نێـوان خـەو و هۆشیاریدا ، ئارامیـان گـرت و بـە هـرای منداڵـی نزڵـەکانی دێ ئاگاداربوونەوە )) (هیچ ، ل ٩١) ... ( بـ . : ئارام بـوون

٦ـ ) : ((پێش ئەوەی کەڵەك لێوی خۆی بە شیرینی گۆم تەڕکا ، گۆم بە سنگی خۆیەوە نا ... لە باوەشی یەکتری ئارامیان گرت)) (بۆتانی ، ل ٤٩) ... (بـ . : ئارام بوون ٢ـ ، ٣ـ ، ٤ـ ، ٥ـ ، ٦ـ و ئارام بوونەوە ١ـ ، ٢ـ ، ٣ـ) .

ئارام لەبەربڕان

(چ . ، تێن ، نس . : ئارام + لەبەر + بڕان) . ئارام لێبڕان ؛ ئارام لێهەڵگیران ؛ ئۆقرەنەمان ؛ ئۆقرەلەبەرهەڵگیران ؛ ناڕەحەت بوون ... ١ـ جێبەخۆنەگرتن بەهۆی کێشە و قەیرانێکەوە ((ئینسانەکانی ئەو دەشتە جارێ وەسەر شاری دەکەوتن ، جارێ دەهاتنە خوارێ ، ئارامیان لەبەر بڕابوو ، چاویان بە ڕێوە بوو کەی خەبەرەکە لە ئاگرییەوە دەگا)) (ئەفسانە ، ل ١٦٢) . ٢ـ بێزار و ناڕەحەت بوون بەهۆی ئێش و ئازارێکەوە ، یان لەبەر خەم و پەژارە ؛ بیرکردن و بیرکردنەوە ... (( ئەوەندەیان لە خانووی داڕووخاو و تەپیو و پڕ لە مۆرانە و تەختەکالۆس و شێدار و بە شۆرەکات دا مابوونەوە تەقی لە جەرگی کردبوون و ئارامیان لەبەر بڕابوو )) (تەنەکە ، ل ١٣) . ((پەرۆشی چاوپێکەوتنەوەی هیوا و کاڵێ هەموو شتێکی لەبیربردبوونەوە ، بەم خەیاڵە دیسانەوە هاتەوە سەر باسی هیوا و کاڵێ و دیسان هەموو شتێکی کەی لەبیرچۆوە و ئارامی لەبەر بڕایەوە)) (ژانی گەل ، ل ٣٠) . ٣ـ کێچ کەوتنەکەوڵ ؛ پەلەی بەجێهێنانی کارێك ... ((شەباب

ئارامی لەبەر بڕابوو ، نەیدەتوانی گیر بێ ، شیر و مەتاڵی نوێی دە شان کرد و تیر و کەوانی هەڵگرت ، سواری ئەسپی بوو و بە ڕێکەوت)) (دمدم ، ل ١٢٦) .

### ئارام لێبڕان

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارام + لێ + بڕان) . (بـ . : ئارام لەبەربڕان) . (( (ئەننا) هەرچەندە شاژن بوو ... بەلاّم هەر ساتێ سەیری فەسالّ و ڕوخساری خۆی بکردایە ، ئارامی لێ دەبڕا)) (خەندەلێو ، ل ٥٨) . ((... دە داخانا خەریك بوو شێت ببێ ... دەهات و دەچوو ، ئارامی لێبڕابوو ...)) (باڵندەکان ، ل ٣٨) .

### ئارام لێبڕاو

( ئنب . ، نس . : ئارام + لێ + بڕ ((بڕان)) + ا + و ) .
١- بێزارکراو ؛ پەستکراو ؛ جاڕزکراو ؛ ناڕەحەتکراو ؛ وەڕزکراو ؛ پەستکراو ؛ قەلّسکراو ... واتای کەسێك دەگەیەنێ کە بە کارێك ناڕەحەت کرابێ (( منداڵە ئارام لێبڕاوەکەیان لەبەرخۆیەوە دەدوا )) (باڵندەکان) .
٢- تووڕەکراو ؛ ڕك هەڵسێنراو ؛ ڕق هەڵسێنراو ... یەکێك بە کارێك دەمارگیر کرابێ . (بـ . : ئارام لێهەڵگیراو) .

### ئارام لێبڕین

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارام + لێ + بڕین) . (بـ . : ئارام لێبڕین) . ١- بێزارکردن ؛ جارزکردن ؛ ناڕەحەت کردن ؛

وەڕزکردن ؛ پەست کردن ؛ قەڵس کردن ... کارێک کە نارەحەتیی هۆشەکی یان بەدەنی بەسەر کەسێك دێنێ . ژانەسەر ئارامی لە نەسرین بڕیوە ... ٢ـ تووڕەکردن ؛ ڕك هەڵستاندن ؛ ڕق هەڵستاندن ... کارێکی ببێتە مایەی دەمارگیریی کەسێك . ∴ شوان هێندەی جوێن دا ، ئارامی لە لاوك بڕی و مستەکۆڵەیێکی لێ سڕەواند .

**ئارام لێهەڵگرتن**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارام + لێ + هەڵ + گرتن) . (بـ . : ئارام لێبڕین) .

**ئارام لێهەڵگیران**

(چ . ، تێن . / کب . ، نس . : ئارام + لێ + هەڵ + گیران) . (بـ . : ئارام لەبەربڕان) .

**ئارام لێهەڵگیراو**

(ئنب . ، نس . : ئارام + لێ + هەڵ + گیر ((گیران)) + ا + و) . (بـ . : ئارام لێبڕاو) .

**ئارام نەگر**

(ئن . ، نس . : ئارام + نە + گر ((گرتن)) ) . ١ـ بێئۆقرە : نارەحەت ؛ بێسەبر ؛ بێحەوسەڵە ؛ دانەسەکناو ... ئێش و ئازارێکی وا ، یان خەم و پەژارەیێکی ئەوتۆ ، یان هەر شتێکی دی مرۆ بە چەشنێك نارەحەت بکا ، ئارامی لێ

هەڵبگریّ . ٢ـ پەرێشان ؛ شپرزە ؛ بیّ ئارام ؛ بیّ هەوا ... ماندوو و لە هێز و وزە کەوتوو . ٣. خەوزڕاو ؛ خەولیّزڕاو ؛ بیّ خەو ... شێوان و تێکچوونی حەوانەوە و خەو . ٤ـ گەڕۆك ؛ گەڕیدە ؛ ڕیتاڵ ؛ عەودالّ ... سیفەتە بۆ کەسێك کە جیّ بە خۆی نەگریّ و هەر خەریکی گەڕان بیّ .

**ئارامی**

(ئو . ، نس . : ئارام + ی) . ١ـ هێمنی ؛ هێوری ؛ لەسەرخۆیی ؛ هێسایی ... (( گەورەپیاوان کە دەگەڵ کاری گران و دژواردا ڕووبەڕوو دەبن ، بە خوێندنەوەی مێژوو کوڵی دڵیان دادەمرکیّ و ئارامیی ڕوویان تیّ دەکا )) (شەرەفنامە ، ل ١٠) . (( مونسی ڕۆژ و شەوم باعیثی ئارامیی دڵم * ڕۆیی و من لە غەمی کەوتمە بەحری عەزاب)) (شێخ ڕەزا ، ل ٨) . ٢ـ شێنەیی ؛ نەرمی ؛ نیان ... ((تا هەوری ڕووی ئاسمان دڕ ئەدا و هەتاو * ئارامیی شیرینتر ئەخاتەوە ناو)) (گۆران ، ل ١٧٩) . ٣ـ خامۆشی ؛ بیّ دەنگی ؛ مەندی ؛ کشوماتی ؛ بیّ شەڕوشۆڕی ؛ بیّ قڕەوبڕیی ... ∴ ئارامیی منداڵەکان هەموومانی ئاسوودە کردەوە . ((خانووی بەگزادە لە سای درەختا * ئارامیی بووکە لە کۆشی بەختا)) (گۆران ، ل ١٢٩) .

**ئاران[1]**

( ن . ) . ١ـ زستانەوار ؛ گەرمەسێر ؛ قشلاخ ... جیّ ژیانی کۆچەر لە زستاندا ؛ بنکەی ژیانی زستانی

کۆچەران . (( پایز بوو ، کۆچەر و ڕەوەندان ، زوو لە زۆزان و کوێستانی سەر چیا بڵندەکان و ڕەش بەڵەکە بەفرەکانەوە بۆ گوندەکانیان گەڕابوونەوە و چووبوونە ئارانان تا بۆ پەزەکانیان ئاخەڵی زستان دروست بکەن)) (دمدم ، ل ٢١٤) . ٢- لەوەڕگا ؛ لەوەڕگە ؛ بژوێن ؛ بژوون ؛ زەمەند ؛ چیمەن ؛ مێرگ ؛ پاوان ؛ گیاجاڕ ... زەویی پڕگیا و جێ لەوەڕ . (( ئەو ئارانە لە بەهارەوە تاوەکو پایز هەروا بە چۆڵی دەمێنێتەوە و پێی ئاژەڵێکی تێ ناکەوێ ، تا پایز لەوەڕی زۆری لێ شین دەبێ . سەردەمێ لەسەر ئەو ئاران و زۆزانانە گەلێ شەڕوشۆڕ دەقەوما)) (دمدم ، ل ٢١٥) . ٣- دەشت ؛ تەختان ؛ تەختانی ؛ تەختایی ... زەویی بێ گرد و تەپۆڵکە . ((هەر ئەو دەمی ، کەناری گۆلی وانێیش وەخەبەرهات ، گوندەکانی دەشت و ئارانیش ، ئەوانیش داوەرینە شاری بایەزیدەوە)) (ئەفسانە ، ل ١١٧) . ((لە دەشتەکانی باشوورەوە ، لە ئاگرییەوە ، لە ئارانی مووشەوە ...)) (ئەفسانە ، ل ١٣٠) . ٤- گۆشتەزەوی ؛ نەرمان ... زەویی بێبەرد و نەرمەنیشك و ساز و لەبار ، کە بۆ کشتوکاڵ دەست بدات . (تب . : بە زمانی لاتینی ((ئارێنا)) بە واتای حەرفی ((خۆڵ)) دەگەیەنێ . لە ڕۆمای کۆن گۆڕەپانێکی دائیری یان هێلکەئاسایی خۆڵ بەسەردا ڕاخراو لە ناوەندی ((ئامفی تیاتر))ی بینای بینەراندا بۆ نیشاندانی زۆرانبازی و بەگژیەکداکردنی کۆیلە و ئەسیری جەنگ و گیانلەبەری دڕندە بەکاردەهێنرا ...) . ٥- بیابان ؛

چۆڵ ؛ دەشت و دەر ؛ سارا ؛ هەردە ... ((ئەگەر وەدۆزام ، بەیان دڵسۆزان * ئەگەر نە هەردی نەجدم بدۆزان * ئەر یاران یەکیٚ ئەو یادم ئاران * یا هام جە هەردان یا جە کۆساران)) (وەلیی دیٚوانە ، ل ٣٠) .

### ئاران[٢]

( چ . ، تیٚن . ) . ئیٚشان ؛ یەشان ؛ ژان‌کردن ... ( بـ . : ئیٚشان ) .

### ئاراندن

( چ . ، تیٚ . ، نس . : ئاران + اندن ) . ١ـ ئازاردان ؛ عەزیەت‌دان ... ٢. زویرکردن ؛ دڵ‌ئیٚشاندن ... ٣. بریندارکردن ؛ زامدارکردن ...

### ئاراو

(ن . ، نس . : ئار ((ئاگر)) + ئاو) . ئاراڤ ؛ ئالاڤ ؛ ژاراڤ ... ١ـ ئاو یان کەفاو و سابووناوی جاریٚك کە بۆ جل‌شتن ئامادەکرابیٚ ... ((ئەوە خەریکی جل‌شتن بووم ، ئاراویٚکم مابوو ...)) (بابان ، ل ١٩) . ((هیٚشتا تازە دەستم لە ئاراوا بوو کە خەبەری مردنی ئاغاژنیان هیٚنا)) (موحەڕەم ، ل ٣) . ٢ـ ئاو یان کەفاو و سابووناویٚکی پاش جل‌شتن ، کە هیٚشتا بە کەڵك مابیٚ . گۆرەوییەکی لە ئاراوی کراسەکاندا بشۆ ...

**ئارایش**

( ن . ) . ( پـهـ . : ئـارایش ) . ئارایشـت : ئـاڕایش : ئاڕایشـت ... ١ـ سووراو ؛ سووراڤك ؛ سپیاو ؛ سـپیاڤ ؛ تاسـولووس ؛ لاولووسـه ... دەرمـانی خـۆ جـوان كردنـی ئـافرەت و ڕازاندنـەوەی ((تـەركی ئارایشـی تـەن نـەقدی ڕەواجی عەرەبە * تۆ عەجەم ، مەردی موزەخرەفت تەنی‌یو قەڵبـەزەنی)) (نـالی ، ل ٦٧) . ((گوڵچـین هەسـتا بـەرەو ئاودەسـتخانەی ئافرەتـان وەڕێ كـەوت ، تـا سـەر و ڕوخسـارێك تـەڕ و ڕووو و ڕواڵـەتی ئارایشـەكەی تازەكاتـەوە)) (هیـچ ، ل ٢٣١) . ٢ـ زێـڕ و زیـو ؛ زێـڕ و زەنبـەر ؛ ڕەوش ؛ خشـڵ و ئەسـپاب و ئـامرازی خـۆ ڕازاندنـەوە ... ٣ـ ڕازاوەیـی ؛ جوانـی ؛ شـۆخی ؛ شۆخ‌وشەنگی ؛ قەشەنگی ؛ ڕێك‌وپێكی . جوانی و ڕێك و پێكی . ((نازك تەدارەك فەسڵی بەهارە * زەریف ئارایش هەردە و كۆسارە)) (پیرەمێرد ، ل ١٧١) . مێزی ~ - ئەو مێزەی بۆ خۆجوانكردن و ڕێك‌وپێك كردن تەرخان كراوە ((... نامەكەی لە نێو پاكەت نا و چەسپاندی بە ئاوێنەی مێزی ئارایشەكەی‌دا)) (هیچ ، ل ٢٣٩) .

**ئارایشت**

( بـ . : ئارایش ) . ( ئارایش ١ـ ، ٢ـ ) : ((هـۆ شـوانی بـەهرەدار ؛ تیٚخـوڕە ، چـاوەڕێـن * ئارایشـت تـەواوە ، ئامادەی هەڵپـەڕكێین)) (گـۆران ، ل ٥٢) . ( ئارایش ٣ـ ) :

((ئەمجا کە سەعاتی قەدی دیواری هۆڵەکە بە کووکوو سێ جارێ ئەخوێند پەردەی پەنجەرەکانم دائەدایەوە ، کەمێك بەرانبەر بە مێزی ئارایشتەکە سەیری خۆمم ئەکرد)) ( مستەفا ، ل ۱۳۳ ) . ((لەش با هەردەی بەهار بێ ئارایشتی * ئاسمانێکی ئەوێ فەڕ با بە گشتی)) (گۆران ، ل ٤٨) .

**ئارایشت دان**

( چ . ، تێ . ، نس . : ئارایشت + دان ) . ( ب . : ئارایش دان ) . (( شاعیر لە کاتی شیعر داناندا ئارایش دانی خۆی لەبیر ناچێ)) (مەسعوود ، ل ٤٠٩) .

**ئارایشتکەر**

(ب . : ئارایشکەر) .

**ئارایشت کردن**

(ب . : ئارایش کردن) . ((لاشە پواوەکەشیان ئەبێتە (خەنە) * کچان ئارایشتی بووك و خەنەبەندانی پێ ئەکەن)) (پێنجوینی ، ل ۱۳) .

**ئارایشتگەر**

(ب . : ئارایشگەر) .

**ئارایشتگەری**

(ب . : ئارایشگەری) .

**ئارایش دان**

( چ . ، تێ . ، نس . : ئارایش + دان ) . ئارایشت دان ؛ ئارایش دان ؛ ئارڕایشت دان ؛ جوان کردن ؛ ڕازاندنەوە ؛ تاس ولووس دان ؛ نەخشاندن ؛ دەست پێداهێنان ؛ ڕێك وپێك کردن ... (( وەکو ( حەمدی ) ئەخوێنن بولبولانی ئەم کوڵستانە * چەمەن ئارایشی داوە گوڵاڵەی خستە تووی مێزەر )) ( حەمدی ، ل ٤٧ ) ... خۆ~ - خۆجوان کردن ؛ خۆڕ ازاندنەوە (بۆ ژنان) : ((لە کوردستاندا ئافرەتی قەڵەو کەم ئەبینی ، مەگەر لە ماڵە گەورە و دەوڵەمەندەکاندا کە فرمانیان زۆر کەمە ، جووڵەیان زۆر کەمە ، بە زۆری وەختیان بە خواردن و دانیشتن و خۆ ئارایشت دانەوە بەخت ئەکەن)) (شاکیر ، ل ٦) . بە حەوت قەڵەم خۆ~ - خۆجوان کردن و دەست بەخۆدا هێنان و خۆ تاس ولووس دانی ئافرەت بە حەوت کەرەستەی خۆڕازاندنەوە : ١ـ خەنە ؛ ٢ـ وەسمە ؛ ٣ـ سووراو ؛ ٤ـ سپیاو ؛ ٥ـ کل ؛ ٦ـ خاڵ ؛ ٧ـ میل . بەڵام وەك ئیدیۆم بە واتای (خۆ جوان کردنی تەواو و خەست و خۆڵ) دێت .

**ئارایشکەر**

(نك . ، نس . : ئارایش + کەر) . ئارایشتکەر ؛ ئاڕایشکەر ؛ ئاڕایشتکەر ؛ تاس ولووسدەر ... ١ـ ئافرەتێك ئارایشی خۆی بکا . ٢ـ ئافرەتێك ئارایشی ئافرەتی دی بکا . ٣ـ دەموچاوهەڵگر . (بـ . : ئارایشگەر) .

**ئارایشکردن**

(چ . ، تیْ . : نس . : ئارایش + کردن) . ئارایشتکردن : ئاڕایشکردن : ئاڕایشتکردن ... (بـ . : ئارایشدان) .

**ئارایشگەر**

( سـن . ) ( نـك . ، نـس . : ئـارایش + گـەر ) . ( بــ . : ئارایشکەر ) .

**ئارایشگەری**

(نیج . ، نس . : ئارایش + گەر + ی) . ئارایشتگەری ... پیشە و کاری ئارایشگەر .

**ئارایی**

(بـ . : ئارا[2]) . مەجلیس ~ - کۆڕڕازاندنـەوە ، ((نـووری عومری صـەرف بۆ کەشفی تـاریکی لـە خـەڵق * وەك چـرا هەرکەس بە شۆخی مـەجلیس ئـارایی بکـا)) (مـەحوی ، ل ١٦) . مەعنا ~ - مانا ڕازاندنەوە : (( نووکی خامەی من کە ببێتە مەعنا ئاراییی کـەمال * خـەط بـە خـەط ئیظهاری نەقشـی صـوورەتـی ( مـانی ) دەکـا )) ( نـالی ، ل ١٠٣ ) . ڕسـتە ~ - ڕسـتە ڕازاندنـەوە : (( هەرچـەند ناوبردنەکـە نەختێکیش لەژێر ڕستە ئاراییدابێ ، دیاردەدا کە مەبەس شەخسـی ( یـەزدان شـێر )ی بنەماڵـەی بەدرخانییـە )) ( مەسعوود ، ل ٣١٥ ) .

**ئارەئار**

(کس .) . زریکەزریك ؛ قیژەقیژ ؛ زیرەزیر ؛ زیقەزیق ؛ هاوارهاوار ... (ب . : زریکەزریك ؛ هاوارهاوار) .

**ئارەخچن**

(ن . ، نس . : ئارەخ / ئارەق + چن ((چنین)) / . ئارەقچن ؛ تەپلە ؛ تەقیلە ؛ کلاو ... کلاوێکە لە پارچە قوماش دەیدروون یان لە بەن و دەزوو دەیچنن و دەیکەنە سەر ، هەر تەپلە سەر دادەپۆشێ . ((خاتوون ئەستێ گوتی : دەبێ سەکۆیەکت لەسەر شەتی جزیرێ بۆ دروستبکەم بنێرم دووسەد تۆپ جاوت بۆ بکرم ، چل قەرەواشت هەیە ، دەگەڵ ئەو قەرەواشانە هێندێك گازری بکەن ، هێندێکیان نارخچنان بدروون)) (تحفە ، ل ٢٤٨) .

**ئارەزۆ**

(ب . : ئارەزوو) . ((ئارەزومە هیچ نەبێ جارێکی ماچکەم زاری تۆ * ئارەزۆی من چووکە ، ئەمما تا بفەرمووی شیرینە)) (هێمن ، ل ٦٩) .

**ئارەزوو**

(ن . ) . (ئست . : ئازی ؛ پە . : ئارزۆك ؛ ئارزووك ؛ سس ؛ ئازەڤ ؛ ف . : آرزو) . ئارزۆ ؛ ئارزوو ؛ ئارزی ...
١ـ ئیشتیا ؛ حەز ؛ مەیل ؛ تاسە ؛ عەزرەت ... ( بۆ خواردەمەنی) . ∴ ئارەزووی ترێ دەکەم ∴ ئارەزووم لە

ساوەرە . ٢ـ حەز ؛ مەیل ؛ هەوەس ؛ خواست ؛ ویست ؛ دڵخواز ؛ دڵخاز... بۆ بینینی دۆست و خزم و کەس‌وکار و نیشتمان و ... چوونە سەیران و گەشت و گوزار و ... خوێندن و زانست ... (دڵ لە دووی شتێك یان کەسێك) . ((ئارەزووی بینینی تۆم کرد ، دڵ لە پڕدا کەوتە حاڵ * هەستی کرد جوانیی بەهار و هاتە گوێم نەغمەی شەماڵ)) (ئیحسان ، ل ١٨) . (( جار جار وەك بەرقی ئاو بۆ زۆر تینوو * دێیت و ناشکێنی تاسە و ئارەزوو )) ( گۆران ، ل ٩٤ ) . ((مەم ژی ژ خیاڵی ڕوویێ دلدار * یانی کو ژ ئارەزوویێ دیدار)) (خانی ، ل ٢٤٨) . ((سەحرا ئەڵێی بەهەشتە * دڵ ئارەزووی لە دەشتە * حەزی لە سەیری گەشتە)) (بێکەس ، ل ١٤٨) . ٣ـ ئاوات ؛ هیوا ؛ هیڤی ؛ ئومێد ، هومێد ؛ کام ؛ نیاز ... مەبەستی پڕ بە دڵ بۆ بەدیهێنان و بەدەستهێنانی شتێك ، کارێك ، ئامانجێك... ((ژیان و ئەرکی ناخۆشی : پەپوولەی ئارەزووی کوشتم * شەرابی جامی دڵداری ، لە تافی لاوییا ڕشتم)) (هەردی ، ل ٧٩) . ((هەر لە ماتیدا ژیام و ئاهونالەی پڕ لە جۆش * ئارەزووی خۆشی ژیان و پێکەنینم بۆ نەهات)) (ئیحسان ، ل ٣١) . ٤ـ دڵداری ؛ خۆشەویستی ؛ سەودا ... ئەوەی دڵ دەیخوازێ (( منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە ، عەشقم گۆڕاوە * دڵم هەر وەکو گوڵی بێ باران سیس و ژاکاوە )) ( بێکەس ، ل ١٢٨ ) . ٥ـ کەیف ؛ هەوەس ... مەیلی کەسێك لەسەر بەجێهێنان یان بەجێهێنانی کارێك

((سوارە : بۆ لێرە ئەبڵەق بووین ؟ با بچین ببینین * با بچین بزانین کوێخا : ئارەزووی خۆتانە)) (ئاسك ، ل ٥٢) .

٦ـ خولیا ؛ کەڵکەڵە ؛ هەڵپە ؛ هەوا ؛ هەوەس ؛ واز ... مرخ و خەیاڵی جووتبوونی نێر و مێ ((بە لار و لەنجە هات بە لامەوە * بێپەروا دانیشت بە ئارامەوە * وتی : ئارەزووی منت کردووە ؟ * خەڵك ناوی منیان بە سووك بردووە)) (پیرەمێرد ، ل ٢٩) . ∴ ئارەزووم لەو کیژەیە بیخوازم ؛ بە ~ گەیشتن - بە ئاوات گەیشتن ؛ بەهیواگەیشتن ... وەدیهێنانی ئاوات و هیوا و نیاز و مەبەست .

**ئارەزووباز**

(ئن . ، نس . : ئارەزوو + باز) . بە کەسێك دەوترێ مەیل و هەوەسی لە شتێك بێت .

**ئارەزووبازی**

(نو . نس . : ئارەزوو + باز + ی) . بوونی مەیل و هەوەس بەرانبەر بە کارێك ، شتێك ... ((ئای لە یارۆ ... چۆن جڵەوی ئارەزووبازی شل کرد)) (خەندەلێو ، ل ١٠٢). ((لە نێوان ئارەزووبازی و ئابروومەندیدا ئاشووبێك بەرپا بوو)) (خەندەلێو ، ل ١٠٧) .

**ئارەزووبزاوتن**

( چ . ، تێ . ، نس . : ئارەزوو + بزاوتن ) . ( بـ . : ئارەزووبزواندن) .

**ئارەزووبزوان**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەزوو + بزوان ) . ( ب . : ئارەزووبزووتن) .

**ئارەزووبزواندن**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارەزوو + بزوان + اندن) – ئارەزووبزاوتن ؛ ئارەزووهەڵستاندن ... ١ـ مەیل جووڵاندن ... ٢ـ خولیاخستنەسەر ؛ هاندان ... ٣ـ هەوەس هەڵستان (بۆ جووت بوونی نێر و مێ) .

**ئارەزووبزووتن**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارەزوو + بزووتن). ئارەزووبزوان ؛ ئارەزووهەڵستان ... ١ـ مەیل جووڵان ... ٢ـ خولیاکەوتنە سەر ... ٣ـ هەوەس هەڵستان (بۆ جووت بوونی نێر و مێ) .

**ئارەزووبوون**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارەزوو + بوون) . – ئارزۆبوون ؛ ئارزووبوون ؛ ئارزیبوون ... ١. ئیشتیابوون ؛ دڵ پێوەبوون ... ( بۆ خواردەمەنی ) . ٢. مەیل بوون ... بوونی مەیل لە چوونی گەشتوگوزار و سەیران و بینینی دۆست و کەسوکار و نیشتمان و شاران و بوونی شارەزایی لە زانست و هونەر ...دا ((من خۆ شەو و ڕۆژ ئارەزووی تۆمەن * پەرێ دیدەنت نەزر و فتۆمەن)) ( مەولەوی ، ل ١٤ ) . ٣. مەیلی ڕوودانی کارێك یان ڕوونەدانی ... ب . : ئارەزوو هەبێ ، ڕێگە ئاسانە – بۆ کردنی هەر کارێك ، ئەگەر مەیل هەبێ ، ئەوە

جێبەجێکردنی ئاسانە . ٤ـ بوونی هەوای جووت بوون لە نێوان نێر و مێدا .

ئارەزووپیدان

( چ . ، تێ . : نس . : ئارەزوو + پێ + دان ) .

١ـ ئیشتیاپێدان : ئیشتیاپێپەیداکردن ... ٢ـ هەوەس جوولاندن ؛ مەیل بزواندن ... ٣. خولیاخستنەسەر ؛ هاندان ...

ئارەزووکردن

(چ . ، تێ . ، نس . : (ئارەزوو + کردن) . - ئارزۆکردن ؛ ئارزووکرن ؛ ئارزیکرن ... ١ـ ئیشتیاکردن ؛ حەزکردن ؛ دڵبۆچوون ؛ مەیل کردن ... ( بۆ خواردەمەنی ) . ٢ـ حەزکردن ؛ مەیل کردن ؛ ویستن ؛ خواستن ... ویستنی چوونە گەشتوگوزار و سەیران و حەزکردنی بینینی دۆست و کەسوکار و نیشتمان و ... شارەزایی پەیداکردن لە زانست و هونەر و ... (دڵ لە دووی شتێك بوون) : ((ئەی وەتەن زۆر ئارەزووی دیداری تۆ دەکەم * ان مرآك یزیل من فوآدی ذا الألم)) (بێکەس ، ل ٦٧) . (( ئاخ خوێندنیش وەکو من ئارەزووی ئەکەم * بێبینیم و نەبێتە گرێی قورسی کفنەکەم )) ( پیرەمێرد ، ل ٢٥١ ) . ٣ـ ئاواتخواستن ؛ ئومێدکردن ... ئاواتخواستنی پڕ بە دڵ بۆ بەدیهێنان و بەدەستهێنانی مەبەستێك : (( بۆ سەیری پووز و قەد و گۆنا و خاڵ ، چاو بێزوو ئەکا * گوێ بۆ

بیستنی ئاوازی زوڵاڵ ، ئارەزوو ئەکا)) (ژیـر ، ل ٦٥) ...
٤ـ ئەڤین ؛ ئەوین ... ٥ـ مەیلی کردنی کارێك یان نەکردنی
... ٦ـ مرخ و خەیاڵ کردنی جووتبوونی نێر و مێ .

### ئارەزوومەند

( ئـن . ، نـس . : ئـارەزوو + مـەند ) = ئارزۆمـەند ؛
ئارزوومـەند ؛ ئارزیمـەند ... ئاواتـەخواز ؛ هیـوادار ؛
هیڤیدار ؛ ئومێدەوار ... بە ئاوات ؛ بە هیوا ؛ بە ئومێد ؛
بـە تاسـە ؛ بـە عـەزرەت ... تامـەزرۆ ... بـاری ئـارەزووی
کەسێك بەرانبەر ئەو مەبەستەی دڵی لە دوویەتی ... حاڵی
کەسێك کە زۆر دڵی بە شتێکەوە بێ ... (( وەك ... فلیمـی
سینەما ... بیخستبا بەر تیشکی نوێژی نیوەڕۆ و هـەموو
ئارەزوومـەندێکی دڵنیـا کردبـا )) ( مەسـعوود ، ل ٢٤٤ ) .
((مدیـان گـوڵاڵن نـە پـای دەربـەندان * ئـەو یـەکتـەر وێنـەی
ئارەزوومەندان)) (مەولەوی ، ل ٤٣١) .

### ئارەزوومەندبوون

( چ . ، تێـن . ، نـس . : ئـارەزوو + مـەند + بـوون ) .
ئارزۆمـەندبوون ؛ ئارزوومـەندبوون ؛ ئارزیمـەندبوون ...
ئاواتـــەخوازبوون ؛ هیواداربـــوون ... بـــەهیوابوون ؛
بـەئومێدبوون ... تامـەزرۆبوون ... بـاری ئـارەزووبوونی
کەسـێك بـۆ ئـەو مەرامـەی لـە نـەزەری گرتـووە . ((وەك
ئەویش شەیدای گوڵێك بێ وەك لێو * ئارەزوومەند بێ بۆ
باخی نشێو)) (کامەران ، ل ٦٤) . ((داڤیدیش بەرانبـەر بە

سەربەستیی ئەو گەرەکی بوو بە هەرەتی گەنجێتی ئارەزوومەند بێ ، ئەوەك ژن و منداڵ ببنە كۆسپ و ...)) (خەندەلێو ، ل ٥٦) .

**ئارەزوومەندی**

(نچ . ، نس . : ئارەزوو + مەند + ی) - ئارزۆمەندی ؛ ئارزوومەندی ؛ ئارزی مەندی ... ئاواتەخوازی ؛ هیواداری ؛ ئومێدەواری ... تامەزرۆیی ... حەز و عەزرەتی كەسێك بۆ ئەو مەبەستەی عەودالێتی . ((ئارەزوومەندیم جە حەد ویەردەن * فراوان خەیلێ تاسەی تۆم كەردەن)) (مەولەوی، ل ١٥) .

**ئارەزووهەڵستان**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارەزوو + هەڵ + ستان) . (بـ . : ئارەزووبزووتن) .

**ئارەزووهەڵستاندن**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارەزوو + هەڵ + ستان + اندن) . (بـ . : ئارەزووبزواندن) .

**ئارەق[١]**

(ن .) ، (ع : عرق) . - ئارەقە ؛ عەرەق ؛ خۆ ؛ خوو ؛ خوویە ؛ خوەی ؛ خوێدان ... ١ـ ئارەقەی لەش : تراوێكی بێ ڕەنگە لووەكان (غدە)ی پێست دەری‌دەدا و لە توێ

(مسامات) وردیلەکانی پێستەوە دێتە دەرێ ، لە ئەنجامی گەرمابوون ، یان ماندووبوون ، یان تووڕەبوون و دڵتەنگی ، یان نەخۆشی ...یەوە ((کانی وتی : کیژ چۆپیکا * ئارەقی خۆی لە کانی کا)) (پیرەمێرد ، ل ٤١) . ((زەرد و سوور گوڵباخی داوە لە سەری * ئارەقی سەر کوڵمی دڵۆپی زیوە)) (گۆران ، ل ٢٠٧) . ((چاڵی تینوێتی ئاوی حەیاتە * قەترەی ئارەقی دوایی مەماتە)) (پیرەمێرد ، ل ١٧٤) . ~ ی ڕەش و شین دەردان : ا ـ زۆر ماندووبوون ، فرە هیلاك بوون ((ئاگری وەکو دێوێکی زەبلاح ئارەقی ڕەش و شینی دەردەدا ، هەناسەبڕکێی بوو)) (ئەفسانە ، ل ١٣) . ∴ تا گەیشتمە لوتکەی چیاکە ئارەقی ڕەش و شینم دەردا ؛ تا تێمگەیاند ئارەقی ڕەش و شینم دەردا . ب ـ خۆماندووکردن ؛ خۆهیلاك‌کردن ... جـ ـ مت . : زۆر شەرمەزاربوون ؛ تەریق بوونەوە ... ∴ هەڵس‌وکەوتی خراپی ئازاد ئارەقی ڕەش و شینی پێ دەردام ... ~ ی ڕەش و شین ڕشتن : ((بۆ بت ، شەیتان * بۆ نۆکەریان * ئارەق ڕەش و شین بڕێژە * هەزار دەردی سەر بچێژە)) ( گۆران ، ل ٢٨٣ ) . ( بـ . : ئارەقی ڕەش و شین دەردان ) . ~ ی ڕەش و شین کردن (کردنەوە) (بـ . : ئارەقی ڕەش و شین دەردان ؛ ئارەق کردنەوە . ~ ی ڕەش و مۆر کردنەوە ( بـ . : ئارەقە[1] ؛ ئارەقەی ڕەش و مۆر کردنەوە) .

◊ بە ~ی ناوچاوان (ناوچەوان) : أ ـ بە ماندووبوونی زۆر) ؛ بە ڕەنجی شان ∴ بە ئارەقی ناوچەوان ئەو ماڵەی پێکەوە ناوە . ب ـ بە هێزی وزە و بازوو ؛ بە ورە و گوڕدان . ∴ بە ئارەقی ناوچەوان کۆڵەی نایە سەر شان ... ٢ـ ئەو شێ و دڵۆپە ئاوەی لە ئەنجامی نیشتنی هەڵم لەسەر شتێك (شووشەی پەنجەرە ؛ سەرقاپی مەنجەڵ ؛ دیواری حەمام ...) پەیدا دەبێ . شێ ؛ شەونم ؛ تەڕایی .

### ئارەق[٢]

(ن .) ، (ع : عرق) – ئەرەق ؛ عارەق ؛ عەرەق ؛ عەرەخ ...
١ـ خواردنەوەیێکی ئالکۆلداری ڕۆژهەلاتی‌یە و خواردنەوەی مرۆ سەرخۆش دەکا . بە زۆری لە خورما و ترێ ... دروست دەکرێ . (( ـ وەرە تۆ چۆڕێ ئارەقم بۆ بێنە و دانیشە با نەختێ قسە بکەین ... ـ لاوە بە سەرسامی‌یەوە وتی : ـ ئارەق ؛ ئەوە نیو قاپەکە نییە لەبەر دەمتا ؟!)) (ژانی گەل ، ل ٢٢٧) . ((وانا شەرابا حەفت سالی و ئارەق ئانین ، جوورە جوورە خوەرن ژی ئانین ژی ئانین ، دانینە سەر تەختە و دەست پێ‌کرن بخون ، قەخون و شابن)) ( کوردۆ ، ل ١٢٣ ) . ٢ـ ئاو یا جەوهەری هەندێ گژوگیا ، وەك : ~ی جاترە ؛ ~ی شاتەرە ؛ ~ی نەعنا ... کە بۆ مەبەستی داوودەرمان دەگیرێ .

**ئارەقاوی**

(ئن . ، نس . : ئارەق + ئاو + ی) . ١ـ لەشی مرۆ یان ئەندامێکی لەشی زۆر ئارەقی کردبێتەوە و ئارەقەکەی پێوە بێ ((... لەشی ڕووتی ئارەقاویی دەروێشەکان لە تۆی کۆز و سکڵ و پشکۆ ئاگری گەش و بە چریسکە چریسکەوە وەکو ئاوی ڕوون فیچقەی دەکرد و دەردەپەڕی)) (ئەفسانە ، ل ١٢٠) . ((ناو لەپە ئارەقاوییەکەی لەو سەری چوارگۆشەکە توند کرد ...)) ( بێگەرد ، ل ٢٥) . ((لە ئەم حەلەدا کابرای دەریاوان بە جارێ زراوی تۆقی ، سەیری دەموچاوە ئارەقاوییەکەی کرد و وتی ...)) (خەندەلێو ، ل ١٧) ... ٢ـ جل و بەرگێك ئارەق تەواو تەڕی کردبێ ∴ کراسەکەم بە جۆرێك ئارەقاوییە ، دەڵێی لە ئاوت هەڵکێشاوە .

**ئارەقە[1]**

(ن .) . ئارەق[1] + ە . (ب . : ئارەق[1]) . ((... ئارەقە بەسەر چاو و لا ملیا ئەهاتە خوارەوە)) (ژانی گەل ، ل ١١) . ((... ئارەقە شێت و شەیدای کردبام ، باوەشێنی کردبام بە پەرچەمان ، فەرامۆش بوومایە بە کەزییان)) (تحفە ، ل ٣٣٨) . ~ ی شین و مۆر کردنەوە ((دیسان گەڕاوە کن ئەسپەکەی ، هەمیسان ڕەگی وە شاخ و باڵان کەوت بە فیڵێهاتنێکەوە بە چواردەوری ئەسپەکەدا خولاوە ، ئارەقەی شین و مۆری کردووە ...)) (ئەفسانە ، ل ٨٦) .

◊ بە ~ ی ناوچەوان ((منی وەرزێر * سوێند دەخۆم بە تیشك و زەوی و * گوڵ و پەرێز * بە ئارەقەی ناوچەوانی بەرز و بەڕێز)) (بیمار ، ل ٢٦) .

ئارەقە[٢]

(ن .) ١ـ دیمەك : لاڤەن : لەڤەن : تیر توی دیوار : داری ناو دیوار ... ئەو دارەی لەناو چینەی دیوار دەخرێ بۆ قایمتر بوونی و باشتر ڕاگرتنی و ڕێك و ڕاست هەڵستاندنی . ٢ـ ئەوسار : هەوسار : هەڤسار : جڵەو : دەستەوسار : دەستەجڵەو : ڕەشمە : دەسکە ڕەشمە : قامچی لغاو ... پەتۆکەی بە ڕەشمەوە بەستراو : پەتی ملی گۆلك . ٣ـ قەڕاسە ... گوریسی سەر بە ئاڵقە بۆ بارپێچان ... ٤ـ مەهار : مهار ... ئاڵقە و پەتیێ کە دەخرێتە لووتی حوشتر و وڵاخی سەرکێشەوە .

ئارەقەڕشتن

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[١] + ە + ڕشتن ) . ( بـ . : ئارەقڕشتن : ئارەقکردن ) . (( هەموو هێزی دایە خۆی ، بە هەردوو دەستی بە نقەنق ، بە ئارەقەرشتن ... توانی گونێکی کیسەکە ، لەسەر لابدا )) ( مەم[٢] ، ل ٥٢ ) . ((دەدێرێ ئاو ، دەچێنێ تۆو ، دەکا جێ شەتڵی پەین و کووت * دەرێژێ ئارەقە ، پەیدابکا تا بۆ مناڵی قووت)) (هێمن ، ل ٥٨) .

**ئارەقەسڕین (ەوە)**

(بـ . : ئارەق سڕین) . ((کابرا بە هەناسەبڕکێ ئارەقـەی نێوچاوانی سڕیەوە)) (دمدم ، ل ٣٢١) .

**ئارەقەکردن**

(بـ . : ئارەق کردن) . ((برایمیان ڕووت کردەوە ، لێرەیان درێژکـرد ، هەرسـێ ژنـی مـیری هـاتن ڕووتیـان کـردووە ڕووت ، یەکیان لەبەرەوە پێوەنا ، یەکیش لـە پشـتەوەیان پێوەنـا ، ئـەوی دیکەشـیان لەسـەر درێـژ کـرد . حـەتتا سەحات و نیوێکی . برایم دەنێو ژنەکاندا ئارەقەی کرد)) (تحفـه ، ل ٣٨٥) . ((دایـك ... شـاد بـوو ، تەنانـەت لـە خۆشی‌یان ئارەقەی کردبوو)) (دایك ، ل ٤٣) .

**ئارەق پێکردن**

(چ . ، تـێ . ، نـس . : ئـارەق + پـێ + کـردن) - ئـارەق پێکردنەوە : عارەق پێکردنـەوە ؛ عـەرەق پێکردنـەوە ... ئەگـەرچی مانـای ڕاسـتەوخۆی ئـەم وشـەیە ، ئـەوە دەگەیـەنێ ، کـە شـتێکی گـەرم ئارەقـە بـە کەسێك بکـا ، یـاخود دەرمـانێك ببێتـە هـۆی ئـارەق‌کردنـەوە بـە نەخۆشـێك ... بـەڵام فـرە پەرەسـەندنی مانـا مـەجازی و ئیدیۆمی‌یەکـەی دەوری مانـا ڕاسـتەوخۆکەی تـەواو کز کردووە . (ئارەق پێکردن) ، وەك ئیدیۆم بەم مانایانە لـە کاردایـە : ١. خەجاڵـەت کـردن ؛ شـەرمەزارکردن ؛ بەشەرمداخستن ... ٢ـ تەریق کردنەوە ... ٣ـ ئاڵۆزاندن ؛

پەشۆکاندن ؛ شڵەژاندن ؛ سەرلێشێواندن ... ٤ـ ترساندن ؛ تۆقاندن ؛ ڕۆح بردن ؛ زراوبردن ؛ ناوك خستن ...

**ئارەق پیٚکردنەوە**

( چ . ، تیٚ . ، نس . : ئارەق[١] + پیٚ + کردن + ەوە ) .

( بـ . : ئارەق کردن) .

**ئارەقچن**

( ن . ، نس . : ئارەق[١] + چن + کردن ((چنین)) ) ( بـ . : ئارەخچن ) .

**ئارەق خواردن**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[٢] + خواردن ) . ( بـ . : ئارەق خواردنەوە) . ((هەقمە گەر ئارەق بخۆم توخوا ڕەفیق لۆمەم مەکەن * زەحمەتە بیٚ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریکەوە)) (بێکەس ، ل ١٣٧) . (( قاچاخا گۆت : ئەم شادبوون ، مە ئارەق دخوار ، لیٚ ئەو مینا خۆشك و بریٚ مە بوون )) (کوردۆ ، ل ١٢٨) .

**ئارەق خواردنەوە**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[٢] + خواردن + ەوە ) .

ئارەق خواردن ؛ عارەق خواردنەوە ، عەرەق خواردنەوە ... مەیخواردنەوە ... خواردنەوەی ئارەق بۆ سەرخۆش بوون ((... هاونیشتمانی ئێمە دەستی لە ناز و نیعمەت و ...

هەڵگرتووە و کەژی گرتۆتە بەر ... ئێمەش خەریکی ئارەق خواردنەوە بین ...)) (ژانی گەل ، ل ١١٧) .

**ئارەقخۆر**

(ئن . ، نس . : ئارەق[٢] + خۆر ((خواردن)) ) . عارەقخۆر ؛ عەرەقخۆر ؛ ئەرەقخۆر ... مەیخۆر ؛ مەینۆش ... کەسێک ئارەق خواردنەوەی کردبێ بە خوو و کاری هەمیشەیی ... (( لەگەڵ سلاوی من وتی بە لوطف و پێکەنینەوە * ئەی کۆنە ئارەقخۆرەکە ، ئەی لاتەکەی شەراب پێکاو )) ( گۆران ، ل ٤٧ ) . ((ئەو غەزەب گیراوە نازانم لە کوێ ئەو ئارەقخۆرەی دیتبوەوە)) ( دایک ، ل ٣٢ ) .

**ئارەقخۆری**

( ن . ، نس . : ئارەق + خۆر ((خواردن)) + ی ) . عارەقخۆری ؛ عەرەقخۆری ؛ ئەرەقخۆری ... مەیخۆری ؛ مەینۆشی ... حاڵەت و کاری خواردنەوەی ئارەق ؛ کردەوەی ئارەقخواردنەوە ... (( ئەم کارە تۆ بۆی هاتوویت نە لەگەڵ ئارەقخۆری و بەزمی ڕابواردنی شەوانتان وە نە لەگەڵ بیر و باوەڕی جارانیشت ڕێک ئەکەوێت )) ( ژانی گەل ، ل ١٠٤ ) .

**ئارەق دەردان**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[١] + دەر + دان) . ( بـ . : ئارەق کردن ) .

ئارەق ڕشتن

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[1] + ڕشتن ) . ١ـ ( بـ . : ئارەق‌کردن ١ـ ) . : (( مامە ڕەجەب بە پەلە و بە ئارەق ڕشـــتن وە ژوور کــــەوت )) ( گێلــــەپیاو ، ل ١٤٣ ) .

٢ـ ماندووبوون و زەحمەت‌کێشان بە کارێکەوە ((دەکێشن زەحمەت و ناخۆن وەکو وان نانی خۆڕایی * دەکەن کار و دەڕێـژن ئـارەق و نـاژین بـە ڕیسـوایی)) (هێـمـن ، ل ٥٩) . ((ڕۆڵەی کوردم فێری هەوراز و لێژم * تا زۆر بڕۆم زیاتر ئارەق بڕێژم)) (هێمن ، ل ١٧٨) . ((چەندین ڕۆژ بوو خانۆ لە بەرەبەیانەوە تا ئێواریێ نەدەسرەوت و هەمیشە بە نێو خەڵکەکــەدا ئەمســەر و ئــەو ســەری دەکــرد و ئــارەقی دەڕشـت)) (دمـدم ، ل ٢٨١) . ((... ئــەوەندەی تــر دەمـار ئەیگرت و ئارەقی ئەڕشت)) (کاوس ، ل ١٢١) .

ئارەق سڕین

( چ . ، تـێ . ، نـس . : ئـارەق[1] + سـڕین ) . سـڕین و وشك‌کردنەوەی ئەندامی لەش لە ئارەقە ((کوێخا گیـان ... وچانمـان نـەداوە * هێنـدە نـەبێ ... ئارەقمـان سـڕیوە)) (ئاسك ، ل ٣١) . ((ئای ... لە ژێر قورسایی بار * ئارەقی ناوچاومــان ســڕی)) (گــۆران ، ل ٣٢١) . ((... ئــارەقی ناوچاوانیان سڕی و پاڵیان لێدایەوە)) (ڕەئووف ، ل ٥) .

ئارەق فرۆش

( ن . ، نس . : ئارەق[2] + فرۆش (( فرۆشتن )) ) .
مەیفرۆش ؛ مەیخانەچی ... فرۆشیاری مەی ؛ کەسێك کاروکاسبی فرۆشتنی مەی بێ .

### ئارەق فرۆشی

(ن . ، نس . : ئارەق[2] + فرۆش ((فرۆشتن)) + ی) .
مەیفرۆشی ؛ مەیخانەچێتی ... فرۆشیاریی مەی ؛ پیشەیێك پێوەندی بە فرۆشتنی مەیەوە هەبێ .

### ئارەق کردن

( چ . ، تێن . ، نس . : ئارەق[1] + کردن ) . عارەق کردن ؛ ئەرەق کردن ؛ عەرەق کردن ؛ عەرەخ کردن ؛ ئارەق دەردان ؛ ئارەق ڕشتن ؛ ئارەق کردنەوە ... ١ ــ ئارەق دەردان ؛ ئارەق ڕشتن ... ئارەقە لە لەشی مرۆ هاتنەدەرێ ... تەریی ئارەقە لە ئەندام دەرکەوتن . ٢ـ مت . : اـ خەجاڵەت بوون ؛ شەرمەزاربوون ؛ بەخۆداشکانەوە ؛ بەشەرمداکەوتن ((ئارەقم کرد و نەجاتی هەر نەدام دەردی گوناح * لەرزوتا داری خەجاڵەت خۆم و ڕووزەردی گوناح)) ( بێخود ، ل ٢٢ ) . ب ـ تەریق بوونەوە ... جـ ـ ئاڵۆزبوون ؛ پەشۆکان ؛ شڵەژان ؛ تێکچوون ؛ سەرلێشێوان .

### ئارەق کردنەوە

(چ . ، تێن . ، نس . : (ئارەق[1] + کردن + ەوە) . ( بـ . : ئارەق کردن ) . ((... بینی چەند تەنگە ئەستووری

هەناسەبڕکێیان پێ کەوتووە ... ئارەقی ڕەش و شینیان کردۆتەوە)) (ڕەئووف ، ل ٥) .

### ئارەق کێشان

( چ . ، تێ . ، نس . : ئارەق[٢] + کێشان ) . ( بـ . : ئارەق گرتن) .

### ئارەق گرتن

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارەق[٢] + گرتن) . - ئارەق کێشان .
١ـ دروست کردنی ئارەق . ٢ـ دەرهێنان یان گرتنی جەوهەر و ئاوی گژوگیا و گوڵ .

### ئارەقگێڕ

(ن . ، نس . : ئارەق[٢] + گێڕ ((گێڕان)) ) . مەیگێڕ ؛ مەیگەڕ ؛ بادەگێڕ ؛ عارەقگێڕ ... کەسێك کە مەی لە ناو مەیخۆراندا دەگەڕێنێ .

### ئارەقگێڕی

( نو . ، نس . : ئارەق[٢] + گێڕ (( گێڕان )) + ی ) .
مەیگێڕی ؛ مەیگەڕی ؛ بادەگێڕی ؛ عارەقگێڕی ... پیشەی گێڕانی مەی لە نێو مەیخۆراندا .

### ئارەقگیر

( ن . ، نس . : ئارەق[١] + گیر ((گرتن)) ) . ١ـ نمەدزین ؛ نەرمەزین .. لبادی ژێر زینی ولاخ ، کە بۆ ئارەقە مژینە .

٢ـ تەکەڵو ... لبادی بن قامیشی ئەملاوئەولای زین ، کە جێگە ڕانی سوارە و ئارەقە هەڵدەچنێ . ٣ـ ژێرکراس : فانیلە ... بەرگێ کە لە ژێر کراسەوە بۆ ئارەقەمژین دەپۆشرێ .

**ئارەما**

(ل .) . (ن .) . دەمی زانی ئاژەڵ .

**ئارەماکردن**

( ل . ) . ( ژ . ، نس . : ئارەما + کردن ) . - زاین ... سێ چوار بزنم ئارەماکەن .

**ئارەوانە[1]**

( م . ) . ( ن . ) . ئاروان[2] : ئاروانە ... وشتری نێر و مێی چوار ساڵانە ...

**ئارەوانە[2]**

(بـ . : عەرەبانە) . ((ئۆتومبێلتان وە چنگ ناکەوێ گەورەم . شتێکی تر ، مەسەلە ئەسپ ئارەوانەی ئەسپ)) (تەنەکە ، ل ١٤٤) . ((... چوون لەسەر ئارەوانەیەك هەڵنیشتن)) (تەنەکە ، ل ٦٥) .

**ئارەی**

(ئن . ) . پڕ ؛ تژە ؛ تژی ؛ لیپ ؛ دارمال ؛ پڕاوپڕ ؛ لێواولێو ؛ لیپاولیپ ... ( بـ . : پڕ ١ـ ) .

**ئارج**

(ن .) . (كڕ .) . حەیزەران ؛ دارحەیزەران ؛ قامیشی هیندی ... دارێكە لە شوێنی گەرم دەڕوێ و لە قامیشی ناوبڕ دەچێ . شلك و جوانە . لەبەر زۆری لە هیندستان ، بە قامیشی هیندی بەناوبانگە . گۆچان و داردەست و دیرگە خێوەت و كورسی ... لێ دروست دەكرێ . گەڵا و توێكڵەكەشی دەكرێ بە ڕایەخ .

**ئارخاڤك**

(كڕ .) . (ن . ، نس . : ئار - ئارد + خاڤ - خاو + ك) .
١- جۆرە كولێرە و ناوساجی‌یەكە ، كە شەكر و ڕۆنی لێدرابێ . ٢- چێشتی ئارد و ڕۆن . (بـ . : (ئاردوڕۆن) .

**ئارخاین**

(ت . ) . (كڕ .) . (ئن .) . ئارخەیان ؛ ئەرخەیان : دڵنیا ؛ بێخەم ؛ دڵئاسوودە ؛ خاترجەم ... بێ ترس و دوودڵی ... (( هەموو گوندی ڕابوون و چوون ئاریكارییا شڤانا . لێ عەلی مەمەد و مەلا خوەدا ئارخاین ما )) ( كوردۆ ، ل ٤٣ ) .

**ئارخاین بوون**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئارخاین + كرن) . ئارخەیان بوون ؛ ئەرخەیان بوون ؛ دڵنیابوون ... بێ‌ترس و دوودڵی بوون و گومان نەبوون .

**ئارخاین کرن**

( کـژ . ) . ( چ . ، تـێ . ، نـس . : ئارخـاین + کـرن ) . ئارخەیان کردن ؛ ئەرخـەیان کـردن ؛ دڵنیاکردن ... ((ئەوێ ب ڤان خەبەرا ئاشڤانچی ئارخاین کر)) . (کوردۆ ، ل ٩٠) .

**ئارخەیان**

( ت . ) . ( م . ) ( بـ . : ئارخـاین ) . ∴ مـن لـەو کـارە ئارخەیانم .

**ئارخەیان بوون**

(م .) (بـ . : ئارخاین بوون) . ? هەموو ئارخەیان بووین و ترسمان نەما .

**ئارخەیان کردن**

(م .) (بـ . : ئارخـاین کـردن) . بـە ئاسـانی مـام بـارامم ئارخەیان کرد .

**ئارختك**

(ن .) مۆتە ؛ مۆتەکە ؛ شەوە ... (بـ . : مۆتەکە : شەوە) .

**ئارخوون**

( کـژ . ) . ( ن . ، نـس . : ئـار + خـوون ) . ئـاگردان ؛ تەندوور ؛ ئۆجاخ ؛ وەجاخ ...

**ئارد**

(ن . ) . (په . : ئارت ؛ ف . : آرد) . ئار[٢] ؛ هارد ؛ ئەرڤان ... ١ـ گەنمی هاڕدراو ؛ گەنمی لە ئاش و دەستاڕ لێکراو . ئەو ماددەیەی لە هاڕینی گەنم پەیدا دەبێ و نان و ئیشی هەویری لێ دەکرێ (( پیرێژن ئەڵێ : بەفر ئارد بووە * قەدریان نەگرتووە و لە کیسیان چووە )) ( پیرەمێرد ، ل ١٣٨ ) . ٢ـ هاڕراوە ؛ دانەوێڵەی هاڕراو ... هاڕراوەی گشت دانەوێڵەیێکی دی ، وەکو : جۆ ؛ برنج ، گەنمەشامی : ئاردی ساوەر ... ((ئاخ هاوڕێی تەمەڵ ، حەڵوای ئاردی جۆ * چۆنتان خستینە گەرمای نیوەڕۆ )) (گۆران ، ل ١٣٧) . ٣ـ کرڕۆ ؛ خاکەڕۆك ...ماڵینی بن خەرمان ؛ گەسکدانی ژێر بەیدەر ... ٤ـ تۆز ؛ خاکە ؛ وردە ؛ هووردە ... وردە تۆزی دار و توو و شتی دی وەك : ئاردەمشار ؛ ئاردەتوو ... (ب . : ئاردەمشار ؛ ئاردەتوو) . ٥ـ مت . : هەر شتێك وەك ئاردبووبێ : بوون بە ~ ؛ بە بوون (( سەری خۆیشی و ئەویشی خوارد * ئەویش ئێسقانی بوو بە ئارد)) (گۆران ، ل ٢٩٠) . کردن بە ~ - بە ~ کردن ∴ پەرداخەکەی کوتا بە زەویدا و کردی بە ئارد . گەردی ~ - خۆڵی لاشەی ڕزیو ((ساڵی گەرد ئارد یاران هەم فەرد * مە دۆم نە دەماخ ئاسیای چەپ گەرد)) (مەولەوی ل ١٧٩) . ◊ ~ ی بێژراوە - شتی پوختەکراو ؛ سازکراو ؛ خەملاو ... ب . : ئاردی بێژراوە ، کەپەکی ماوە - واتە باشی ڕۆیوە و خراپی ماوە . ئاردی ڕۆیوە و سۆسی ماوە ، بە شتێك دەوترێ ، کە کەڵکی نەمابێ .

**ئاردالْ**

( بـ . : ئاردەلْ ) .

**ئاردان**

(کڕ . ) . (ن . ، نس . : ئار + دان) . ١ـ (ئەمار ؛ ئەنبار ؛ عەنبار ؛ عەمار ...)ی ئارد . ٢ـ (گوونی ؛ گوێنی) و هەر شتێکی دی ، کە ئاردی تیْبکریْ .

**ئارداوێژ**

(ن . ، نس . : ئارد + هاوێژ ((هاویشتن)) ) . ئاردەشان . ١ـ ئەو شوێنەی بەرداش ئاردی لێوە دەخاتە قوڵکە ئاشەوە - واتە لێوارە بەرداش لە گەڕاندا کە ئارد دەهاوێژرێتە ناو قوڵکە . ٢ـ ئەو شوێنەی ئاردی لە لێواری بەرداشەوە تیْ دەڕژیْ . ٣ـ مت . : أ ـ دەم و گفت ؛ دەمودوو ؛ دەموپل ؛ دەموکاوێژ ... بریتی‌یە لە دەراوی (بواری) دەمی قسەکەر ، واتە شێوە و قسەکردن و ئاخاوتنی و تەرزی . ب ـ قسەی پڕوپووچ ؛ وتەی بیْ سەروبەر ... ◊ ی خۆشە - بە یەکێك دەوتریْ دەراوی قسەی خۆش بیْ ؛ قسەی بە دەم خۆش بیْ ؛ خۆش دوو و سەروزمان شیرین بیْ .

**ئارداوی**

(ئن . ، نس . : ئارد + ئاو + ی) . تۆزی ئاش گرتوو ؛ تۆزی ئارد لیْنیشتوو ... حاڵی کەسێکی تۆزی ئاش یان ئاردی لیْ نیشتبیْ و سپی بچێتەوە ((خاڵۆ حوسەین کە

سەیری لەش و لار و سەر و ڕوخساری خەڵووزاویی من و سەر و سوێڵی ئارداوی قۆمیسەری کرد قاقا کەوت بە پشتا)) (کۆردەرە ، ل ١١٦) . ((جامبازەکان سەروچاویان ئارداوی بوو)) (قەرەداغی ، ل ٥٥) .◊ شانی ~ خۆی دەکا ، تۆمەت بە خۆکردن ؛ خۆ تووش‌کردن ؛ خۆ تێوەگلاندن (لە کردارێکی خراپ یان تاوانێك یان کێشەیەکدا) ـ واتە یەکێك لە کارێکی نابەجێدا یان لە قەوماوێکی خراپدا نەبووە ، کەچی وای دەردەخات ، کە بەشداری کردووە ، یان ئەو کردوویەتی . بەمە لە هیچی نەبوو خۆی لەکەدار و تاوانبار دەکا .

**ئاردە**

( ئن . ) . نوێباو ؛ تازەباو ؛ تازەبابەت ؛ تازەداهاتوو ؛ تازەداهاتگ ؛ نویٚداهاتگ ؛ نۆهاتی... (ب . : تازەداهاتوو) .

**ئاردەبارە**

( ن . ، نس . : ئارد + ە + بار + ە ) . ئاردەوارە ؛ ئاردبەهرە ؛ مزەی ئاش ؛ قرەمزە ... بەشە ئاردێك ، کە ئاشێر بۆ هەر بارێك کەمێکی بە خۆشیی خۆی بە ئاشەوان دەبەخشیٚ .

**ئاردەبرنج**

( ن . ، نس . : ئارد + ە + برنج ) . برنجی هاپراو ؛ هاپراوەی برنج ؛ ئاردی برنج ( ب . : ئارد ٢ـ ) .

**ئاردەبێژ**

(ئن . ، نس . : ئارد + ە + بێژ ((بێژن ؛ بێژانەوە) . هەر شتێ زۆر ورد هاڕابێتەوە ، وەك ئاردی دابێژراوی لێ هاتبێ .

**ئاردەتوو**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + توو) . تووی وشکی کرەکراو .

**ئاردەجۆ**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + جۆ) . جۆی هاڕاو ؛ هاڕراوی جۆ ؛ ئاردی جۆ (بـ . : ئارد ٢ـ) .

**ئاردەساوەر**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + ساوەر) . ساوەری هاڕراو ؛ هاڕراوەی ساوەر ؛ ئاردی ساوەر (بـ . : ئارد ٢ـ) .

**ئاردەشان**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + شان ((وەشاندن)) ) . (بـ . : ئارداوێژ) . ((هەنی چێش وا چوون چۆن مەکەرۆ چوون * گەرد ئاردەشان ئاسیای گەردوون)) (مەولەوی ، ل ٢٤٩) .

**ئاردەڵ**

(ن .) . (سن .) . ئاردالْ ؛ ئەردەڵ . ( ئلْ . : ئۆردۆنناز ؛ فر . : ئۆردۆنناسە ؛ ڕس . : ئۆردیناریێتس ) کە لە وشەی (ئوردینۆ)ی لاتینییەوە وەریان گرتووە و ، وشە لاتینییەکەشی واتای (ڕێکی دەخەم ؛ دای دەمەزرێنم ؛

بەڕێوەی دەبەم) دەگەیەنێ . لە سوپای زووی ڕووسیدا بە ئەفسەرێکی بچووك دەوترا ، کە لە بارەگای سوپا ، یاخود لای سەرکردە ، یان لە کن کەسێکی پایەبڵند دادەنرا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانیان ، بەڵام لە سوپای چەکداری سۆڤیەتدا ، لە کاتی شەڕی دووەمی جیهاندا ئەو ئەرکە بە ( سەرباز ) سپێررا . وا پێ دەچێ کوردی ئێران لە ڕووسییەوە وەریانگرتبێ و سنووری بەکارهێنانییان فراوان کردبێ : ١ـ پێش خزمەت ؛ گزیر ... ڕاوێژکار یان جێبەجێکەری فەرمانی گەورەپیاوان . ٢ـ گزیر ؛ فەڕاش ... بەردەستی پێشکار . ٣ـ دەردیان ؛ زیندانەوان ... پاسەوانی بەندیخانە .

## ئاردەلان

(بـ . : ئەردەلان) .

## ئاردەڵۆك

( ن . ، نس . : ئارد + ەڵ + ۆك ) . ئاردەڵوکە ؛ ئاردەڵووکە ... ١ـ وردە ئاردی سەر لێوی قوڵکە لە ئاشدا . ئاردێ کە لە ناو قوڵگەی ئاش دەمێنێتەوە . ٢ـ مت . ئەوەی لە وردی و سپێتیدا لە ئارد بچێ ، بەتایبەتی بەفری زۆر ورد و وشك کە دەبارێ (بەفرلووکە ؛ وردە کلووی بەفر) . ((کاسە بۆیە لازمە تا ئاردەڵۆکی دەربدا * سەوڵی بۆیە لازمە نەك جۆگە بیبا بەتاو)) (نالی ، ل ٢٦١) . (( وەضعی ئاشی گەر نەبێ ، بۆچی دەبێ پڕ ئاردەڵۆك * طەبعی قوففەی گەر نەبێ ، دەنیشتە سەراو )) (نالی ، ل ٢٦٢) .

**ئاردەڵوکە**

(بـ . : ئاردەڵۆک) .

**ئاردەڵووکە**

(بـ . : ئاردەڵۆک) .

**ئاردەڵین**

(ن . ، نس . : ئارد + ەڵ + ین) . تۆزئاشی زۆر نەرم .

**ئاردەمشار**

( ن . ، نس . : ئارد + ە + مشار ) . بڕەمشار ؛ ئاردی هەڕە ... وردەی دار و تەختە ، کە لە پاش بڕینەوەیان بە مشار ، دەکەوێتەوە .

**ئاردەن**

(هـ .) . (چ .) . (ف . : ئاوردەن) . (بـ . : ئانین ؛ هاوردن ؛ هێنان) . ((فەرماش : لەب خوشك من بە هاجەت ئار *جە ذات مەعبوود مەشنەوی ئەخبار)) (هەمەوەند ، ل ٢١٣) .

**ئاردەنە**

(د .) . (بـ . : ئانین ؛ هاوردن ؛ هێنان) .

**ئاردەنۆک**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + نۆک) . نۆکی هاپڕاو ؛ هاپڕاوەی نۆک ؛ ئاردی نۆک (بـ . : ئارد ٢ـ ) .

**ئاردەوا**

(ن . ، نس . : ئارد + ە + وا) . ١ـ چێشتی شل و تراو . ٢ـ شۆربای ئاردی گەنم . ٣ـ پەڵوو ؛ پەڵووڵەی ئاردی .

**ئاردەوارە**

(بـ . : ئاردەبارە) .

**ئاردەینە**

(بـ . : تازەداهێنراو) .

**ئاردبەهرە**

(ل .) . ئاردەبارە ؛ ئاردەوارە ؛ مزەی ئاش ؛ قرەمزە ... (بـ . : ئاردەبارە) .

**ئاردبێژانەوە**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئارد + بێژان + ەوە) . ئارد لە هێڵەك دان ... كاری ئارد بە هێڵەك دابێژان .

**ئاردپێچ**

(ك .) . (ن . ، نس . : ئارد + پێچ ((پێچان ؛ پێچانەوە)) . ١ـ جۆرێك حەڵوایە لە ئارد و شەكر دروست دەكرێ . ٢ـ مارمارۆكە ( هەویر وەك ماری لێ دەكرێ و بۆ منداڵ دەبرژێنرێ ) .

**ئاردزرشك**

( ل . ) . ( ن . ، نس : ئارد + زرشك ) . برۆیش ؛ برۆش ... (بـ . : برۆیش) .

**ئاردفرۆش**

(ن . ، نـس . : ئـارد + فـرۆش ((فرۆشـتن)) ) . کەسـێك ئارد بفرۆشێ ... فرۆشیاری ئارد .

**ئاردفرۆشتن**

(چ . ، نس . : ئارد + فرۆشتن) . فرۆشتنی ئارد .

**ئاردفرۆشی**

(ن . ، نـس . : ئـارد + فـرۆش + فرۆشـتن) . پیشـەییێك پێوەندی بە فرۆشتنی ئاردەوە هەبێ ؛ فرۆشیاری ئارد ...

**ئاردکێش**

( ن . ، نـس . : ئـارد + کێـش (( کێشـان )) ) .
١ـ ئاردکۆوەکـەر . جـۆرە خاکـەناز یـان بێڵێکـی داریـنـە ئاشـەوان ئـاردی پـێ لـە قوڵکـە دەردەدا و ڕادەکێشـێتە دواوە و کۆدەکاتـەوە و لـە دەوری بەرداشـەکان دووردەخاتـەوە ... ٢ـ کـوڵهـەڵگر : حـەماڵ ؛ بارهـەڵگر ؛ مرۆی بارهەڵگری باراش .

**ئاردلوو**

(ل .) . (بـ . : ئەردەلاّن) .

**ئاردماڵ**

(بـ . : ئاردماڵك) .

**ئاردماڵك**

(ن ، نس . : ئارد + ماڵ ((ماڵین)) + ك) . ئاردماڵ ؛ تۆپەڵە پەڕۆییێکە ئاشەوان جێ ئاردی پێ دەماڵێ و خاوێن دەکاتەوە .

**ئاردم**

(ب . : ئاردمی) .

**ئاردمدار**

(کس .) . یارمەتیدەر ؛ یاریدەدەر ؛ ئاریکاریکەر ؛ هاریکاریکەر ؛ کۆمەککەر ... (ب . : یاریدەدەر) .

**ئاردمداری**

(کس .) . یارمەتیدەری ؛ یاریدەدەری ؛ ئاریکاریکەری ؛ هاریکاریکەری ؛ کۆمەککەری ... (ب . : یاریدەدەری) .

**ئاردمی**

(کس .) . یارمەتی ؛ یاریدە ؛ ئاریکاری ؛ هاریکاری ؛ کۆمەك ؛ ئاردم .. ( ب . : ئاریکاری ) . (( هەما دەنگی ئاردمی ئو هەوارییێ * وی بگهێژە وانی و سپیانێ )) (جەلالی ، ل ٦٨) .

**ئاردمیدایین**

(کس .) . یارمەتیدان ؛ یاریدەدان ؛ ئاریکاریکردن ؛ هاریکاریکردن ؛ کۆمەك کردن ... (ب . : یاریدەدان) .

**ئاردن**

(هـ .) (چ . ، تیَ .) . ئانین : ئینان : هاوردن : هیَنان : هانین : ئاردەن : ئاردەنە ... (بـ . : هیَنان) . ((تۆ شەلَلاَ هەنیَ پایەت بۆ زیاد * من چیَشم کە نام من ئاردی وەیاد)) (وەلیی دیَوانە ، ل ٧٠) . ((خوداوەند بەی تەور تۆش ئاردی فەرهەم * سا هەر بەی تەرزە نامش نیای (شەم) )) (وەلیی دیَوانە ، ل ٣٢) .

**ئاردوڕۆن**

(ن . ، نس . : ئارد + و + ڕۆن) . میوانی : میڤانی : ئارخاڤك[٢] ... چیَشتیَکە لە (ئارد) و (ڕۆن) و (شەکر) ، یان (دۆشاو) دروستدەکریَ ، بە زۆری بە ژنی زەیستانی دەدەن ، هەتا هیَزی بیَتەوە بەر .

**ئاردوو**

ئاوردوو : سووتەمەنی : شەوتۆك : چیلکەوچەوالَ : قرش و قالَ : پڕوپووش : پووشوپەلاَش ... ( بـ . : ئاوردوو : سووتەمەنی ) . ((گولَبەهار کزرە ئاردوویەکی هیشکی دار و دەوەن لە دەوروبەران خڕکردەوە ... ئەگەر ئاگرەکە ڕووی لە کوژانەوە دەکرد ، گولَبەهار هەلَدەستا دەچوو باوەشیَکی ئاردوو دیَنا)) (ئەفسانە ، ل ١٦٦) . ∴ ئیسالَ مە ئاردوویَ خوە دانییە .

**ئاردی**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئارد + ی) . (بـ . : ئاردەوا) .

**ئاردین**

(ل .) . (بـ . : ئاردینه) .

**ئاردینه**

(ئن . ، نس . : ئارد + ین + ه) . ئاردین ... شتی له ئارد دروستکراو .

**ئارزان**

(کژ .) . (ئن .) . ئەرزان ؛ هەرزان ؛ کەم نرخ ؛ کەم بەها ... (بـ . : هەرزان) .

**ئارزان بوون**

( کژ . ) . ( چ . ، تێن . ، نس . : ئارزان + بوون ) . ئەرزان بوون ؛ هەرزان بوون ؛ کەم نرخ بوون ؛ کەم بەهابوون ... (بـ . : هەرزان بوون) .

**ئارزان کرن**

(کژ .) . (چ . ، تێ . ، نس . : ئارزان + کرن) . ئەرزان کرن ؛ هەرزان کردن ؛ کەم نرخ کردن ؛ کەم بەها کردن ... ( بـ . : هەرزان کردن ) .

**ئارزانی**

(کژ . ) . ( نو . ، نس . : ئارزان + ی ) . ئەرزانی ؛ هەرزانی ؛ کەم نرخی ؛ کەم بەهایی ... (بـ . : هەرزانی) . ∴ ئیسال ئارزانی یە .

**ئارزەن**

(كـژ . ) . (ن .) . چەنـە ؛ چەناگـە ... (بـ . : چەناگـە ؛ ئارزینگ) .

**ئارزم**

(كس .) . (ن .) . (بـ . : ئارزووم) .

**ئارزوو**

(كژ .) . (ن . ) . (بـ . : ئارەزوو ؛ ئارزی[٢] ) .

**ئارزووكرن**

(كـژ .) . (چ . ، تـیّ . ، نس . : ئارزوو + كـرن) . ( بـ . : ئارەزووكردن ) .

**ئارزووم**

(كژ .) . (ن . ) . ئارزم ؛ گلی كەمەربەند ؛ گلی پشتێن ...

**ئارزوومەند**

(كـژ . ) . ( ئـن . ، نـس . : ئـارزوو + مـەند ) . ( بـ . : ئارەزوومەند) .

**ئارزوومەندی**

(كژ .) . ( نچ . ، نس . : ئارزوو + مەند + ی ) . (بـ . : ئارزوومەندی) .

**ئارزێل**

(کس . ) . (ن . ) . تەختەبەند : کەت ... تەختی دارینی لەسەر نوستن . ( بـ . : ئارامگا ٤ـ ) .

**ئارزی**[1]

(کژ . ) . (بـ . : ئارەزوو) .

**ئارزی**[2]

( کـژ . ) . خۆیـی : خۆیایـەتی : خـودی ... ١ـ ( بــ . : تایبەت ) . ٢ـ خاوەن ماڵ : مالا خوە : مـالخوە ... (( ئـەڤ ڕەونــەقیٚ ئــارزی و زاتــی * بــوو نوســخەییٚ ســیحر و موعجیزاتی )) (خانی ، ل ١٨٦) .

**ئارزێتی**

(کژ . ) ١ـ (بـ . : تایبەتی) . ٢ـ خـاوەن مـاڵی : مـالخویی ... ∴ دکانا من ئارزێتی‌یە .

**ئارزینگ**

(بـ . : چەناگە : ئارزەن) .

**ئارژنگ**

(ن .) . دارێکی سوور پێستە وەك بەلاڵووك ، داردەست و گۆچانی لیٚ دروست دەکەن .

**ئارساول**

(كس . ، دم .) . (ت .) . (ن .) . پاسەوان ؛ پاسەبان ؛ پاسگر ؛ ئێشككگر ؛ ئێشكچی ؛ قەرەوڵ ؛ جەزایەرچی ؛ حەسحەس ... (بـ . : ئێشكگر ؛ پاسەوان) .

**ئارسم**

(گژ .) . (ن .) . ١ـ هەڵامەت ؛ ئالامەت ؛ پەتا ؛ پەسیو ؛ پەسیڤ ؛ پەرسیو ؛ درم ؛ ئاهۆ ؛ دەمەنی ؛ ساڤ ؛ فرفینك ؛ مرك ؛ باهۆرە ؛ هەرسم ... ٢ـ ئووفە ؛ سەقاو ؛ مقاو ؛ مەقاو ... (هەڵامەتی ئاژەڵ) .

**ئارسمیْكەتن**

(كژ .) . (چ . ، نس . : ئارسم + یْ + كەتن) . هەڵامەت گرتن ؛ سەرمابوون ... (بـ . : هەڵامەت گرتن) .

**ئارشل**

(كژ .) . (ن . ، نس . : ئار[٢] + شل) . شۆربای ئارد ؛ لەپەئارد ...

**ئارشڤێرش**

(كس .) . ئالشڤێرش ؛ ئالوویڵ ؛ ئالوویر ؛ سەودا و مامەڵە ؛ كڕین و فرۆشتن ؛ ئاڵش وێرش ؛ ئاڵشت دان وستان ... ( بـ . : ئالوویر ) . (( تاجر ـ ئاغا چوو ئارشڤێرشی بكا )) (كوردۆ ، ل ١١٦) .

**ئارشڤێرش کرن**

(کس .) . ( چ . ، تێ . ، نس . : ئارشڤێرش + کرن ) . (بـ . : ئاڵوویرکردن) .

**ئارفرۆش**

(کس .) . (بـ . : ئاردفرۆش) .

**ئارڤان**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئار + ڤان) . ئازووخە ؛ ئازووقە ؛ زەخیرە ... (ئارد) . (بـ . : ئاروان[1] ) . ((ژ باژار دەرکەت ، بالا خوە دایێ ، کۆ ڤایە حەمالەکی تەلیسککەك ئارڤان ل سەر پشتا وییە)) (زارگۆتن ، ل ٦٩) .

**ئارڤانە**

(بـ . : ئاروان) .

**ئارکان**

( کس . ) . ئەدەب ؛ شەرم ... ( بـ . : ئەدەب ١ــ ) . بێ~ - بێئەدەب ؛ بێئارکانی - بێئەدەبی ... ((پەرێشان ـ خانمێ گۆتە مەعموود ـ پاشا : تو چ مەرێکی بێ دینی ؛ بێ ئینسافی ؛ بێ یۆڵی ؛ بێ ئارکانی ...)) (زارگۆتن ، ل ٢٤٩) .

**ئارکۆز**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئار[1] + کۆز ٣ـ) . ١ـ خۆڵەمێش ؛ خۆڵەکەوە ... ٢ـ سووتوو ؛ سووتك ... (بـ . : خۆڵەمێش ؛ سووتوو) .

**ئارکۆلڤان**

(کچ .) . ( ن . ، نس . : ئار[1] + کۆل ٥ـ + ڤان ) . (بـ . : توونچی) .

**ئارکۆلك[1]**

( کژ . ) . ( ن . ، نس . : ئار[1] + کۆل ٤ـ + ك ) . ( بـ . : ئاتەشکێش ) .

**ئارکۆلك[2]**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئار[1] + کۆل ٣ـ + ك) . گڕی ئاگر ... (بـ . : گڕ) .

**ئارگا**

(هـ .) . (ن . ، نس . : ئار[1] + گا) . ئاگردان ؛ ئاورگ ... (بـ . : ئاگردان) .

**ئارگۆن**

(ئن . ، نس . : ئار[1] + گۆن ٢ـ) . ئاگری ئاگرئاسا ؛ وەك ئاگر (ڕەنگ) : سوور و گەش لە ڕەنگی ئاگر ...

**ئارگووش**

(کژ .) . (ن .) . (بـ . : کەروێشك) .

**ئارگوون**

(کژ .) . (بـ . : ئارکۆن) .

**ئارم**

(ل .) . (بـ . : ئارام) .

**ئارمانج**

(كژ.) . (ن .) . (بـ . : ئامانج) . ((گەلەكی قایم بوو بۆ ب جیەئینا وان ئارماجێد)) (خدر و خەلیل ، ل ١٣٥) . ((یەك ئارمانج * یەك ڕێزان * یەك ڕامان * خەباتێ بكی * ژ بۆ كوردستان)) (صەبری ، ل ٦٧) .

**ئارمانجێ**

ئەزموونی دەستڕاستی و لە نیشاندان و ئەنگێوەیی و پێكان لە ململانێ و پێشبڕكێ و كێبەركێی تفەنگ و تیر .

**ئارمویش**

(كژ.) . (ن .) . (بـ . : ئاوریشم) . ((پرچێ دەلالێ ، وەكی ئارمویشێ نەرم و دەلال ل سەر بالیفێ بژالە بوی ...)) (بامەرنی ، ل ٨٧) .

**ئارمووش**

( ن . ) . ( بـ . : ئاوریشم ) . (( ژنان بە مێزەرێكی ئارمووشی كۆمك و كۆقیەكانیان بە پۆیلە و پلپلە و سلسلەوە وەكو تیشكی ڕۆژ دەچریسكایەوە )) (ئەفسانە ، ل ١٢١) .

**ئارنج**

(ن .) . (بـ . : ئاخیە) .

**ئارنگ**

(ن .) . شەلكە و نەخۆشییەكی ئاژەڵە .

**ئاروان**[1]

(ن . ، نس . : ئار[2] + وان) . ئازووخه : ئازووقه : زەخیره ... ( ئارد ) . ئازووخەی ساڵێکی ئارد له ماڵدا . (بـ . : ئارڤان) .

**ئاروان**[2]

(بـ . : ئارەوانه[1] ) .

**ئاروانه**

(ن . ، نس . : ئاروان + ه) . (بـ . : ئارەوانه[1] ؛ ئاروان[2] ) .

**ئاروان لۆك**

(ن . ، نس . : ئاروان + لۆك ٢ـ) . وشتری نێری چوار ساڵان .

**ئاروان وشتر**

(ن . ، نس . : ئاروان + وشتر) . وشتری مێی چوار ساڵان .

**ئارویْ**

(ن .) . خەیار ؛ ئاروو ؛ هاروو ؛ هارویْ ... (بـ . : خەیار ؛ ئاروو) .

**ئاروبالاْ**

(ل .) . ( ن . ، نس . : ئارو + بالا ) . شەویلکه ؛ لاشەویلاك ؛ شەویلاکه ... (بـ . : شەویلکه) .

**ئاروشك**

(کژ .) . (ن .) . پژمە ؛ پشمە ؛ بنژە ... (بـ . : پژمە) .

**ئارۆ**

(هـ .) . (ئلك . ، نس . : ئا ((ئەم)) + ڕۆ ((ڕۆژ)) ) . ئاڕۆ ؛ ئەمرۆ ؛ ئەوڕۆ ؛ ئیمڕۆ ؛ ئیڕۆ ؛ ئەڤرۆ ... ( بـ . : ئەمڕۆ ؛ ئیمڕۆ ) . (( ئەی ڕەسوول ئارۆ شەوفش پەروازدا * وە ناز و ئیعزاز کار تۆ ساز دا)) (مەولەوی ، ل ٩٩) . (( ئارۆ دیم بە چەم نازك ئەندامێ * ساوای تەن ئەراو تولە نەمامێ )) (بێسارانی ، ل ٢٥) . ((من واتم : درود مەوانە ئارۆ * هەر ڕوکن و مەقام دوعای وێش دارۆ)) (هەمەوەند ، ل ١٤) . ((ئارۆ قیبلۆ من ، بە لەنجە و لارە * تەشریفش وە لای ، تۆ ئامان هارە)) (صەیدی ، ل ٢٠٠) ... پـ . : ئارۆ سەوایش پەنە کەرۆ – ئەمڕۆ سبەینێی پێ دەکا . ◊ ئارۆ ، ئارۆن – ئەمڕۆ ، ئەمڕۆیە . واتە ـ ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە ، کە لێی دەترسای ؛ ئەمڕۆ ڕۆژی منە ...

**ئارۆزیان**

(چ . ، تێن .) . وروژان ؛ هوروژان ... (بـ . : وروژان) .

**ئارۆك[١]**

(کژ .) . (ن . ، نس . : ئار[٢] + ۆك) . ١ـ جۆرە کفتەیێکی پانکەلەیە ، کە لە ساوەر یان گەنمەکوتاو دروست دەکرێ . ٢ـ ئاردکردنە ناو ڕۆنی داخکراو . تۆزێك ئاویش

دەكرێتە ناو ڕۆنەكە پێش داخ كردنی . ((میڤان ڕابوون سفرا پارێڤ و مەدخونی ئارۆك * هنەكان قەلوون دكێشاند ، هنا ژی گوه ددا چیرۆك)) (مەمێ ئالان ، ل ١٤٤) .

**ئارۆك[٢]**

(كڕ .) . (ئن .) . (ئار[٢] + ۆك) . گرینۆك : بەقین ... (بـ . : گرینۆك) .

**ئاروو[١]**

( ن . ) . خەیار : هاروو : ئاروێ : هاروێ ... ( بـ . : خەیار ) . ((دانیشتی‌یە لە بن تووێ * ئارووی دەخوا بە چەقۆێ)) . (فۆلكلۆر ، ل ٥٩) ... پـ . : ئارووی بڕكێكن ، مێرووی كونێكن / ئارووی بڕكێكن ، ڕێویی كونێكن = واتە خاوەنی یەك ڕەگەز و ڕەچەڵەكن ... ئاروو بە بڕكێوە جوانە - مرۆ بە كەسوكار و خزم و ناسیاوانەوە سەنگی هەیە ... ◊ ئارووی بڕكێكن - یەك شتن : لە ڕەچەڵەكێكن : لە یەك ڕەگەزن ...

**ئاروو[٢]**

(ن .) . ئاڵوو : هاڵوو ... (بـ . : ئاڵوو) .

**ئاروو[٣]**

(ل .) . (ن .) . ١- پووك : پدوو ... ( بـ . : پووك ) . ٢- چەناگە ... (بـ . : چەناگە) .

**ئاروو**[٤]

(ن .) . مەلاشوو ؛ ئاسمانەی دەم ... (بـ . : ئارووهار) .

**ئاروودە**

(کڕ .) . (بـ . : ئاڕوفتە) .

**ئارووغ**

قڕقێنە ؛ قرپ ... (بـ . : قڕقێنە) .

**ئارووهار**

(ل .) . مەلاشوو ؛ مەلاشك ؛ ملاشك ... (بـ . : ئاروو[٤]) .

**ئارهان**

(کـڕ . ) . (چ . ، تێـن . ) . برژانـەوە ؛ سـووتانەوە ؛ چووزانەوە ؛ کولانەوە ... ژان و ئێشی ئەندامی سووتاو . (بـ . : برژانەوە) .

**ئارهاندن**

(کڕ .) . ( چ . ، تێ ) . چزاندن ؛ داخ کردن ... داغکردن بە ئاگر .

**ئارهایی**

(کـڕ .) . (ن .) . ئێـش و ئـازارێکی هەمیشـەیی‌یە لـە ئەندامێکی لەشدا .

**ئاریا**

( کرژ . ) . ( ن . ) . ١- ڕق : ڕك : کین : تووڕەیی : قار : هێس ... ( بە . : ڕك ) . (( دەمێ عەبدولڕەحمان ئاغای (عەبدو) گولێ بوی گەلەك کەربێت وی ڤە بون . ئاریا رها ناڤ چاڤێت وی ستویر بو )) (بامەرنی ، ل ٦٦) . ((عەبدولڕەحمان زور باشی پتر ئاریا گوت : )) (بامەرنی ، ل ٧٣) . ٢- خەم : غەم : دەردوخەم : کەسەر : کەرب ... (بە . : خەم) .

**ئاریان[1]**

( چ . ، تێـن ) . دڵ تێك چوون : دڵ تێك هالاّن : دڵ تێك هەلاّتن : دڵ تێکەلاّتن : دڵ بەیەکاهاتن : دڵ شێوان : دڵ هەڵشێوان : شێوانی دڵ : هێلنج دان ... دڵ تێك چوون و دڵ هەڵشێوان و هێڵنج دان لە خواردنەوە .

**ئاریان[2]**

(ژ .) . (تێن) . دوومەڵ و زیپکە لە لەش هاتن .

**ئاری[1]**

(کرژ .) . (ن . ، نس .) . کۆمەك : کۆمەگ : یاریدە : یارمەتی : ئاریکاری : هاریکاری : هاری : ئالی : ئالیکاری ... (بە . : ئاریکاری) .

**ئاری[2]**

(ئن .) . نیشتەجێ . بەیەکجارەکی دامەزراو لە شوێنێك .
× کۆچەر .

**ئاری**[3]

(کژ.) . (ن .) . خۆڵەمێش : خەڵەکەوە : مشکی : خۆڵی : بوولْ ... (بـ . : خۆڵەمێش) .

**ئاری**[4]

(کژ.) . (ن .) . بەزم : حەشر : گەڕ : تەشقەڵە : دەبە : شڵتاخ : شڵتاغ ... ((مادام تە ئەڤ شۆرکر ، ئەزێ ئارییەکە مەزن ب سەرێ تە دا بینم)) ( مەمێ ئالان ، ل ١٠٤ ) . (( زوو هەڕە : ئەگەر ب کوشتنا برایێ من بەژی ، زینێ خەلاس کە ژ ڤێ ئاری و ڕەزلییا هانە )) ( مەمێ ئالان ، ل ١٣٦) .

**ئاری**[5]

( ن ) . لە ئاسەواری هەرە دێرینی میللەتە هیند و ئەوروپاییەکاندا ، ئەم میللەتانە خۆیان بە ( ئاری ) ناوبردووە ، کە واتای (ئادەمیزادی خاوەن مافی تەواو) دەدات و بەمە لە میللەتانی دراوسێ ، یان ژێردەستە خۆیان جیاکردووەتەوە . دواتر لە وشەی (ئاری)یەوە ، گەلێك ناوی نەژاد و ڕەگەز و جوگرافی ڕۆنراوە . بەوێنە هۆزی ماد بە خۆی وتووە (ئاریزانت) ... وشەی (ئێران)ی ئێستا لە (ئاریان)ەوە وەرگیراوە کە (وڵاتی ئاری) دەگەیەنێ ...

**ئاریباری**

(کی .) . (ن . ، نس . : ئاری + باری ٣ـ) . ١ـ هەڵوورژە : هەڵووچە : هەڵووچکە : هەڵووجە : زەردەلوو ، ئاڵووچە :

عەلووچە ؛ عەلووکە ... (بـ . : هەلّووژە) . ٢ـ ئالّووبالّوو ؛ بەلاّلّووک ؛ هەلالووک ؛ هەلهەلووک ... (بـ . : بەلاّلّووک) .

**ئاریختیٚ**

(ن .) . میراو ؛ میراڤ ... کەسیٚ کە دابەشکردنی ئاوی ئاودیٚرانی ئاوایی بە دەستە .

**ئاریش**

(ن .) . بیر ؛ هزر ؛ هۆش ؛ یاد ؛ بیراهی ... (بـ . : بیر[1]) .

**ئاریشە**

(ئن .) . چەتوون ؛ چەتن ؛ دژوار ؛ تووش ؛ سەخت ؛ زەحمەت ... (بـ . : دژوار) .

**ئاریک**

( ن . ) . ( کژ . ) . میچ ؛ بن‌میچ ؛ بن‌بان ... ( بـ . : بن‌میچ) .

**ئاریکار**

( ن . ، نس . : ئاری + کار ) . ١ـ ئالیکار ؛ هاریکار ؛ یاریدەدەر ؛ یارمەتی‌دەر ... کی‌سیٚک دەستی کەسانی دی بگریٚ و لە جیٚبەجیٚکردنی کاریاندا یارمەتی‌یان بدا . ٢ـ ( بـ . : ئاجودان ١ و ٢ ) . ٣ـ پشتیوان ؛ پشتۆڤان ؛ پشتەڤان ؛ پشتگر ... (بـ . : پشتیوان ١ـ) .

**ئاریکاری**

( ن . ، نس . : ئاری + کار + ی ) . ١ــ ئالیکاری : هاریکاری : یاریدەدەری : یارمەتیدەری ... کاری یارمەتیدان و هاریکاریکردن . ٢ـ پشتیوانی : پشتۆڤانی : پشتەڤانی : پشتگری ... (بـ . : پشتیوانی) .

**ئاریکاریخواستن**

( چ : نس . : ئاری + کار + ی + خواستن ) . ١ــ خواستنی ( ئالیکاریکردن : هاریکاریکردن : یاریدەدان : یارمەتیدان : کۆمەك کردن ) . لە کەسێك . ٢ــ داوای (پشتیوانیکردن : پشتۆڤانیکرن : پشتەڤانیکرن : پشتگریکردن) لە یەکێك .

**ئاریکاریکردن**

(چ . ، تیّ . ، نس . : ئاری + کار + ی + کردن) . ١ــ ئالیکاریکردن : هاریکاریکردن : یاریدەدان : یارمەتیدان : کۆمەك کردن : ئالیکردن : ئاریکردن ... ڕەوتی یارمەتیدانی کەسێك یان کۆمەڵێك . ٢ـ پشتیوانیکردن : پشتۆڤانیکرن : پشتەڤانیکرن : پشتگریکردن ... ڕەوتی پشتیوانی کردنی یەکێك یان کۆمەڵێك .

**ئاریکرن**

(کڗ .) . (چ . ، تیّ . ، نس . : ئاری + کرن) . (بـ . : ئاریکاریکردن) .

**ئاریله**

( ئـن . ) . ژنانیلـه ؛ سـەرژنـانی ؛ پیـاوی ژنـانی ... پیاوێك خوو و ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ژنانه بیٚ . ( بـ . : ئاڵی ) .

**ئارین**

(کـس .) . (رس . : ئـارات) . (چ . ، تـیٚ .) . زریکـان ؛ زریکـاندن ؛ قیـژان ؛ قیژانـدن ؛ زیڕانـدن ؛ زیقـاندن ؛ هاوارکردن ... (بـ . : زریکاندن ؛ هاوارکردن) .

**ئارینۆك**

( ن . ، نـس . : ئـاری[٢] + نـۆك ) . لەتکـەنۆك ؛ لەپـە ؛ نخۆشەر ...

**ئارییایی**

(ئـن . ، نـس . : ئـاری + ی + ایـی) . کەسـێك یـان میللەتێك ، کە بە ڕەگەز (ئاری) بیٚ .

**ئاریٚ**

١ـ (ئـ .) . ئا ؛ ئەریٚ ؛ ئادی ؛ ئـەدی ؛ با ؛ بـەڵیٚ ؛ هـەریٚ ... (بـ . : (بـ . : ئـا[٢]) . (( ئـاریٚ بـه حـەدیـث و نـەصصی قورئـان * حوببـی وەتـەنـه دەلیلـی ئیمـان )) ( کۆیـی ، ل ١٩٦ ) . ((گەردشی چاوت قەراری عاشقی میسکین دەبا * ساحیری چاوبەستە ، ئـاریٚ ، دڵ دەکێشـیٚ دیـن دەبـا ؟)) (وەفایی ، ل ٣) . ((ئاریٚ تا پەی خەندەی صوبح جەبهەی ئەو)) (مەولەوی ، ل ٨٩) ... ٢ـ (ئـ . ، ئك .) . بۆ گومـان و باوەڕنـەکردن و سەرسـوڕمان : ئاهـا ؛ ئـەها ؛ تۆبڵێـی ؛

دەشێ ؛ ڕەنگە ؛ شایەتا ؛ لەوانەیە ؛ وێدەچێ ... ∴ مام هۆمەر بڕیاری داوە جارێکی دی ژن نەهێنێ . ئارێ ! ... (ئارێ) دەشێ دووپات بکرێتەوە و بوترێ (ئارێئارێ) ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی پتر جەختکردنی مەبەست بۆ هەمان ئەو دوو مانایەی سەرەوە : ١ـ (( ڕووی دڵئارامم بەهەشتێکە لە ئەمکانی خلوود * ئارێ ئارێ عیشقی نەسلی ئادەمی بۆیە دەکا )) (سالم ، ل ١٩٦) . (( یار دڵی خوێنین و چاوی پڕ لە گریانی دەوێ * ئارێئارێ گوڵ لە باغان ئاوی بارانی دەوێ )) ( نالی ، ل ٧٠١ ) ... ٢ـ (( چاوەکەت با ( امکە ! ) خەط هات و بە من ڕوحمی نەکرد * ئارێ ئارێ مەردومی ئەو کیسە هەر دوون هیمەتە )) (وەفایی ، ل ١١٩) .

### ئارێخ

(کژ .) . (ن .) . (بـ . : ئاخیە) .

### ئارێزە

(د .) . (نبـ .) . (بـ . : کراوە ؛ ڤەکری) .

### ئارێشاندن

(کژ . ) . (چ . ، تێ .) . حەڕشاندن ؛ ڕووشاندن ... (بـ . : ڕووشاندن) .

### ئارێنج

(کژ .) . (ن .) . دوومەڵ ؛ دمەڵ ؛ قوونار ؛ قونێر ؛ کوان ؛ کۆڤان ... دوومەڵی بن باخەڵ ؛ دوومەڵی بن هەنگڵ . ئەو دوومەڵەی لە بن باخەڵ دەردەچێ .

**ئاڕا[1]**

(بـ . : ئارا[1]) .

**ئاڕا[2]**

(ع . : آراء) ، کۆی (رأی)یـه . (ن .) . ئـارا[2] ؛ ڕا ؛ بـیر ؛ هـزر ؛ فکـر ... بـیروڕا و بۆچوونـی کەسـێك سـەبارەت کێشـەیێك . ∴ لـە کۆبوونەوەکـەدا ئـاڕای جۆربـەجۆر ئاڵوگۆڕکران .

**ئاڕاستە**

(بـ . : ئاراستە) .

**ئاڕاستەکردن**

(بـ . : ئاراسـتەکردن) . (ئاراسـتەکردن ١ـ ا) : ((کەواتـە هـەر وەك گوتـت ، ئـەوا شـانی کەشـتی‌یەکە ئاڕاسـتەی ڕۆژئاوا دەکەمەوە)) (خەندەلێو ، ل ١٧) . ( ئاراسـتەکردن ١ـ ب ) : بـە کـردەوە نایابـەکانیان مێـژووی وڵاتیـان نەخشـاندووە ... ڕەوتـی پێشـکەوتنیان بـۆ ئاڕاسـتە کردووە)) (خەندەلێو ، ل ٥٢) . (ئاراستەکردن ١ـ ج) : ((لە تارمایی سێ کەسـەکە ورد بـووەوە ، وای بـۆ دەهـات کـە قسـەکانیان ئاڕاسـتەی ئـەو دەکـەن)) (مـەم[2] ، ل ٢٠) . (ئاراستەکردن ٢ـ) . : ((مێژووناسین ژیـری و وریـایی بـۆ پیاو زیاد دەکا و ئاڕاستەی ڕاوێژ و بیری ڕاستی دەکا)) (شەرەفنامە ، ل ١٠) .

**ئاڕایش**

(بـ . : ئارایش) .

**ئاپایشت**

(بـ . : ئارایشت) .

**ئاپایشت دان**

(بـ . : ئارایشت دان) .

**ئاپایشتکەر**

(ئارایشتکەر) .

**ئاپایشت کردن**

(بـ . : ئارایشت کردن) .

**ئاپایشتگەر**

(بـ . : ئارایشتگەری) .

**ئاپایشتگەری**

( بـ . : ئاپایشتگەری )

**ئاپایش دان**

(بـ . : ئارایش دان) .

**ئاپایشکەر**

(بـ . : ئارایشکەر) .

**ئاپایش کردن**

(بـ . : ئارایش کردن) .

**ئاپایشگەر**

(بـ . : ئارایشگەر )

**ئاپایشگەری**

(بـ . : ئارایشگەری ) .

**ئاڕفتە**

(بـ . : ئاڕوفتە) .

**ئاڕەفتە**

( بـ . : ئاڕوفتە ) .

**ئاڕوفتە**

( ئن . ) . ئاڕفتە ؛ ئارەفتە ؛ ڕفتە ؛ ئارووده ... ١ـ پواو ؛ داڕزاو ؛ داڕزیو ؛ شڕ ؛ شڕووڕ ... تەنراوێك كە لە كەڵك كەوتبێ و تان‌وپۆی دەركەوتبێ . ٢ـ داڕماو ؛ داڕووخاو ؛ خاپوور ؛ وێران بوو ؛ نوغرۆبوو ؛ ڕۆچوو ؛ كاول ... بە دیوار یان خانووی داڕوو خاوی سەرەوژێر بوو دەوترێ . ٣ـ داوەشاو ؛ تێك شكاو ؛ پەك كەوتە ... لەكاركەوتنی ئەندامی لەشی مرۆ ... ((دڵ ئەمیرشەن جەلات ئەسیرە * چون تاوان كاران بەند زنجیرەن * ئامان صەد ئامان خاس نیگاش دارە * وەرنە ئاڕەفتەن زوو مبۆ پارە)) (مەولەوی ، ل ٤٠٠) .

**ئاڕۆ**

(بـ . : ئەمڕۆ ، ئارۆ) .

**ئاڕین**

(بـ . : هاڕین) .

**ئاز[1]**

(ئن . ) . سەخت ؛ تووش ؛ زەحمەت ؛ دژوار ؛ چەتوون ... ((سلێمان خان ئەوێ ڕۆژێ بە ڕێنەکەوت ، ئێوارێ بانگی بەکر بەگی کوردی کرد ، گوتی : ـ بەکر بەگ من سبەینێ بۆ قەلاّی دمدم ، بۆ میوانیی خانۆی کورد دەچم ، بەلاّم ڕێگا ئاز و چەتوونە و شارەزاش نیم ، دەبێ لەگەلّم بچی و ڕێبەرێم بکەی)) (دمدم ، ل ١٠٤) .

**ئاز[2]**

(ئن .) . ١ـ ساخ ؛ ساغ ؛ نەشکاو ؛ باش ؛ چاك ... × نەخۆش ؛ شکاو ؛ عەیبدار ... (( تا ڕۆژێك شەیتان خۆی گۆڕی و لە بیچم و تەرزی بزیشکدا هاتە لای زەهاك و پێی گوت : چاری ماری سەرشانت هەر مێشکی لاوانە . ئەگەر بێتو هەموو ڕۆژێ بە مێشکی تازە و گەرماوگەرم بیان هەنوی ، ئیتر هەر یەکاویەکە و بە ئامان و زامان چاکت دەکاتەوە و وەك گوێزی ئازت لێ دێتەوە )) (شەرەفنامە ، ل ٢٦) ... ٢ـ ڕاست ؛ ڕاستگۆ ؛ ڕاستبێژ ؛ درۆنەکەر ... مرۆی ساغ و ڕاست و بێ فڕوفێڵ ...

**ئاز[3]**

(بـ . : ئازا[1] ١ـ) .

**ئاز[4]**

(ج .) . (بـ . : ئەو[1]) .

**ئاز[5]**

(ئن ـ) ـ بەتەماع ؛ تەماعكار ؛ چاوبرسی ؛ چاڤ برچی ؛ چـاوچنۆك ؛ چاوتێرنـەخۆر ؛ هەڵپەكـەر ... لـە پێنـاوی دەستخستنی ماڵدا .

**ئاز[6]**

(ن ـ) ـ زیپكـەی شیری ـ ئـەو چینچك و زیپكانـەی لـە ڕووی منداڵی شیرەخۆرە دێن .

**ئاز[7]**

( ن ـ ) ، ( ل ـ ) ـ ١ـ هێز ؛ توانا ؛ وزە ... ئـاز لـە تێـی نەماگە ـ ٢ـ هەڕەت ... دەمی پتەوبوون و تێگەیشتن ... ∴ لە ئازی لاویدا ... هاوین ئازی میوەیە ...

**ئاز[8]**

(ن ـ) ـ (د ـ) ـ نەوە ؛ وەچە ؛ بەرە ؛ تیرە ...

**ئازا[1]**

( ئـن ـ ) ـ ١ـ بوێـر ؛ بەجـەرگ ؛ جـامێر ؛ جوامـێر ؛ جەسوور ؛ دلاوەر ؛ دلێر ؛ گـەڕناس ؛ نـەترس ؛ ئـەگیت ؛ مێرخاس ؛ ڕەشید ؛ مـەرد ... (ئست ـ : ئەزامی) ـ مرۆی مەرد و بوێر لە ژیان و كاری ڕۆژانە و جەنگ و شەڕدا ... یـاخود گیـانداری چاونـەترس و دڕ ... ((نییـە دەخڵـم لـە شانامە و مـەصافی ، غـەیری ئـەم نوكتـە * كـە كوشـتـەی بەندی تۆیە هەر كەسێ ئازاد و ئازا بێ)) (نـالی ، ل ٥٩٨) .

(( لە پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ و شێری ئازا بوو * ئەمێستا مار و مێروو ، گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران )) ( کۆیی ، ل ٩١) . ((ماندووی سەرخەوێك بشکێنە لە لام * ئێشکت ئەگرم ، مەترسە ئازام)) (پیرەمێرد ، ل ٤٢١) . ((گەلێکی وا ئازا و سەربەست * بە باوەڕی ئازادی مەست)) (گۆران ، ل ٢٣٨) . (( بەختیاری بۆ کەسێکە خۆی لەبیرچێ بۆ گەلی * دانەنیشێ ، تێبکۆشێ ، مەرد و ئازا هەڵکەوێ)) (ئیحسان ، ل ٢٠) . (( ئەو پەرچەمە پەرێشانەی * بە وێنەی دوو هەڵۆی ئازا کە دەڕوانێ * ڕاست لانەی دڵی پێ دەزانێ )) (بیمار ، ل ١٩) ... ئازا گۆ و ئازا مەیدان ، واتا هەی لە گوتندا ئازا ، ئەوە مەیدان ... بۆ هاندانی یەکێك دەوترێت ، کە بە قسە تەواو بێت و لە کرداردا سست بێت ... ٢ـ مت . : چاپووك ؛ چالاك ؛ چوست ؛ بەتاو ؛ بەگوڕ ؛ خوشڕەو ؛ خێرا ؛ گورج ؛ توند ؛ پتەو ؛ پەیت ... ( ئست . : ئازوو ؛ ئاسوو ) . مرۆ یان گیانداری بەکار و لەش سووك لە بەجێهێنانی کاردا ∴ ... شیروان ئازا کەوتە ڕێ و دەمەو نیوەڕۆ گەیشتەوە گوندەکەی خۆیان ... بۆرە ئازا خۆی گەیاندە نێچیرەکە ...

ئازا[٢]

(کژ .) . (ئن .) . ( ب . : ئازاد ) . ((تو دهونی عەمرێ ڕەنگین * ب دلێ شا ، فکرێ ئازا)) (شکۆ ، ل ١٩) . ((ئو ل ورا ما ئازا و هێسا * وی وەختەکێ نەدی زۆر زختیا ئاغا)) (جەلالی ، ل ٢٦) .

**ئازا**[3]

( ئن . ) . ١ـ بەکاکڵ ؛ ساغ ؛ ساخڵەم ؛ بێخەوش ؛ بێعەیب ... × پووت ؛ پووچ ؛ پووچەڵ ... گوێزی ~ - گوێزی ئازا ئەوەیە بە کاکڵ بێ و کاکڵەکەی بە ئاسانی دەربێت و توێکڵ تەنك بێ . ◊ وەك گوێزی ~ یە - واتە ساغ و بێخەوشە . ٢ـ (بـ . : ئاز[2] ١ـ) .

**ئازا**[4]

( ل . ) . ( ئن . ، نس . : ئاز[2] - هێز + ا ) . بەهێز ؛ بەتوانا ...

**ئازا**[5]

(ن .) . (ع . : اعضاء) . ئەندام ، ئەعزا ... ئەندامی لەش . کورد ئەم وشەیەی لە قاڵبی کۆوە وەرگرتووە ، کەچی بۆ تاك بەکاری دێنێ . کاتێك کۆیدەکاتەوە ، وشەی وەك (هەموو ، گشت ...)ی دەخاتە پێش : (هەموو ئازام ؛ گشت ئازای ...) . ((دەستێکی خستبووە سەر مشتوی خەنجەرەکەی ، هەموو لەشی ئەجووڵایەوە ، هەروا خوێن لە هەموو ئازای ئەباری)) (لە خەوما ، ل ٤٨) . ((هەر ئازام پەی وێش شین و زاریشەن * لاڵە و ناڵەی سەخت زام کاریشەن)) (مەولەوی ، ل ٣٣٧) . ((بروسکەییێکی ئازاری تر لە باڵێوە بەرەو هەموو ئازای ئەندامی کەوتە گەشت)) (ڕەئووف ، ل ٤١) . (( ... گرتیان و بە پێلەقە ئازای ئەندامیان شکاند)) (هەتاو ، ل ٢٨) . ((گشت ئازای بەدەنێی * لەتلەت و کون بووە)) (قوباد ، ل ١٠٥) .

**ئازاب**

(ن .) . (ع . ، عذاب) . (بـ . : ڕەنج) . ((ڕۆڵـه ، میرمـەم ، گیـانی گیانانـه ! * ئـازابی خۆمـت لێ حـەلاڵ بـێ دەگـەڵ شیری هۆردك مەمكانه * مـەچۆ شاری جزیـرێ ، شارێکی بەد قەدەمه ، ویسراعەتی گـەلێك گرانه)) (تحفه ، ب ١ ، ل ٢٥٣) .

**ئازابوون[١]**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئازا[١] + بوون) . ١- بەجەرگ بوون ؛ جەسـووربوون ... مرۆیێـك یـان گیـانداریْك لـه سـەرەتادا ئازانـەبووه و دوایـی ئـازا بـووه . ٢ـ مـت . : مرۆیێـك یـان گیانداریْك له پێشدا گورج وگۆڵ نەبووه و دواتر توندی و پتەوی و خێرایی پەیداکردووه .

**ئازابوون[٢]**

(کژ .) . (چ . ، تێن . ، نس . : ئاز[٢]ا + بوون) . . (بـ . : ئازادبوون) . ((پێرێ لێ مەتا مابوو ، دل لێ شابوو *چاخێ دەست و لنگێ وی ژ پێچەکی ئازابوو)) (چریکه ، ل ١٩) . ((دەبه ڕابوون تەڤ مەشییان * ئازابوون خوەرا گـەرییان)) (چاچانی ، ل ١٩) ... ( کنج . ) . ( بـ . : خۆش بوون ) . : مـت . : (( دایکـی بەنگینـه دەڵـێ : ڕۆڵـه ، لـه شـیری دایکـی خـۆت گـەردنت ئـازا بـێ دەسـت لـه ئاغایـه خـۆت هەڵناگری ! )) (تحفه ، ب ١ ، ل ٢٥٤) .

**ئازاپ**

(کس .) . (بـ . : ئازەب : عازەب) .

**ئازاپی**

(کس . ) . (بـ . : ئازەبی : عازەبی) .

**ئازاتی**

(بـ . : ئازایەتی) .

**ئازاد**

(ئن .) . ( ئست . : ئازاتە : پە . : ئازات ) . ١ـ ڕزگار : سەربەست : سەربەخۆ ... ا ـ یەکێك بەند و دیل و ئێخسیری یەکێکی دی یان شتێك نەبێ : ((لە بەهەشتا بە یادی تۆ شادم * بە تەماشای فریشتە ئازادم)) (پیرەمێرد ، ل ١٦٣) . ((دەر لەحظە پدەر جە بەند بی ئازاد * وێم دەست بە قەدەم (سید الامجاد) )) (هەمەوەند ، ل ١٧) . ((د باغێ لەفظ و مەعنایێ * (شخن) من سەروی ئازادە)) (جزیری ، ٥٦٤) . ((سا دەی وەجامێ دڵم بکەر شاد * بەڵکو بۆ یاروو بەزمێ وە ئازاد)) (مەولەوی ، ل ٤٧٦) ... ب ـ میللەتێك یان وڵاتێك لە ژێر دەستی بێگانەدا نەبێ و خۆی حوکمی خۆی بکا ، واتە سەربەخۆ بێ : ((کاتێ جەژن ئەکەم بگەم بە مراد * میللەتم شاد بێت ، نیشتمان ئازاد)) ( بێکەس ، ل ٢٣٣ ) ... ٢ـ ڕاهی : سەربەست : ئاواڵە ، ئاوەڵا ، واڵا ، وازە ... ا ـ ئافرەتێك ڕووی خۆی دانەپۆشێ و شەرم لە پیاوان نەکا . ب ـ هەر کەسێك لە

هەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکیدا شەرم نەکا و والآ و کراوە بێ . ٣ـ بێتاوان ، بێگوناه : بێسووچ ؛ بێخەتا ...

**ئازادار**

(کژ .) . (ب . : ئازادکەر) . ((لێ تو کیدەرێی ، ئازاداریّ من * ئەز تە کو بگەریم ، رۆنایا من)) (چریکە ، ل ١٢٢) .

**ئازادانە**

( ئن . ، ئك . ، نس . : ئازاد + انە ) . ١ـ بەئازادی : بەسەربەستی ؛ بەرزگاری : بەسەربەخۆیی ... ژیان و کار و کردەوەییێك ئازادی و سەربەستی تێدا بێ . (( ... تۆ ئەڵێیت من بەزەییم بە تەڕی بێگوناها دێتەوە ، بەلاّ من بەزەییم بە تەڕ و وشکا دێتەوە و هەردووکیان بە بێ تاوان و بە شایانی ژیانێکی ئازادانەی پڕ دڵنیایی و سەربەرزی و خۆشی ئەزانم)) ( ژانی گەل ، ل ٢١٨ ) . (( دەستی ئەوتۆ هەیە ... دەرفەت بەوەندە گۆڕانەش نادا کاری ئازادانەی خۆی بکا ...)) (مەسعوود ، ل ٢٤) . ٢ـ سەربەستانە ... بە چەشنی کەسێکی ئازاد و سەربەست ∴ نەشمیل ئازادانە هەنگاوی دەنا ، دەتوت پێشمەرگەیە .

**ئازادەگی**

( ف . ) . ( ب . : ئازادی ؛ سەربەستی ) . (( ئەگەر ئازادەگییەك بێ لە عەدەمدا * بۆمان چی هەیە غەیری بەپێچی پەلەپەل داوی حەیات )) (مەحوی ، ل ٦٤) .

**ئازادبوون**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئازاد + بوون ) . ١- ڕزگاربوون ؛ سەربەست بوون ؛ سەربەخۆبوون ؛ خۆیبوون ؛ بەربوون ؛ بەرەڵڵابوون ؛ ڕەهابوون ؛ قوتاربوون ... ا ـ یەكێك لە بەندی و دیلی و ئێخسیری ڕزگاری بووبێ ، یاخود لە زیندان بەربووبێ : ((منیش دەروونم شاد بێ * ملم لە بەند ئازاد بێ)) (گۆران ، ل ١٠٥) . ((لە ستەم و جەور و بێگار * لە قەدەغە و ئەشكەنجە و دار * ئازاد ئەبم * پاش دڵتەنگی دڵشاد ئەبم)) ( گۆران ، ل ٢٤٨ ) . ب - میللەتێك یان ولاتێك لە ژێردەستی بێگانە ڕزگاری بووبێ : (( بێنە جووڵەجووڵ با ڕۆحیان شاد بێ * پێی میللەتەكەم لە بەند ئازادبێ )) ( پیرەمێرد ، ل ٣٤٧ ) . ٢- ڕاهیبوون ؛ سەربەست بوون ؛ ئاوەڵابوون ... ئافرەتێك یان هەر كەسێك لە نەریتی كۆن و شەرم لە خەڵك كردن و گیرۆدەیی ڕاهیبووبێ : ∴ ئەگەر چەند جارێك كچەكەت بەریتە نێو كۆڕ و برادەران لەو شەرمە ئازاد دەبێ .

**ئازادخوا**

(بـ . : ئازادیخوان) .

**ئازادخواه**

(بـ . : ئازادیخوان) .

**ئازادكەر**

(نك . ، نس . : ئازاد + كەر) . ڕزگاركەر ... بەرەڵڵاكەر ... قوتاركەر ... ١- كەسێك یەكێك لە بەندی و دیلی و

ئێخسیری ڕزگار بکا ، یاخود لە بەندیخانەی بەرڵلا بکا .
٢ـ کەسێك یان کۆمەڵێك یان پارتێك یان لەشکر و سوپاییێك میللەت یان نیشتمان لە ژێردەستی ڕزگار بکا : (( نەسرین بە سەربەرزی‌یەکەوە پێی وت : کە وا هەردوو کوڕەکەی لە لەشکری ئازادکەری نیشتمان‌دان )) ( ژانی گەل ، ل ١٧٠ ) . ٢- ڕاهی‌کەر ؛ ئاواڵەکەر ... کەسێك یان ڕێکخراوێك ، هەر کەسێك لە نەریتی کۆن و کێشەی نابەجیٚ ڕاهی بکا ... (بـ . : ئازادار) .

ئازادکراو

(بـ . : ڕزگارکراو) . ((خەڵکەکەش بە چاوی خۆزگە و ئومێد و ئێرەیی‌یەوە دەیانڕوانی‌یە مەلە ئازادکراوەکان)) (باڵندەکان ، ل ٦٣) .

ئازادکردن

(چ . ، تیٚ . ، نس . : ئازاد + کردن) . ١ـ ڕزگارکردن ؛ سەربەستکردن ؛ سەربەخۆکردن ؛ بەردان ؛ بەرەڵلاکردن ؛ ڕەهاکردن ؛ قوتارکردن ... أ ـ ڕزگارکردنی یەکێك لە بەندی و دیلی و و ئێخسیری ، یاخود لە زیندان بەردانی . ب ـ ڕزگارکردنی میللەتێك یان وڵاتێك لە ژێردەستی بێگانە : ((بەشێکی دەستەی دوژمنانی نیشتمانە ... ئەوی کەشیان بەرەی بزووتنەوەی ئازادکردنی نیشتمانی‌یە)) (ژانی گەل ، ل ١٦٦) . ٢ـ ڕاهی‌کردن ؛ سەربەستکردن ؛ ئاواڵەکردن ؛ ئاوەڵەکردن ... ئافرەتێك

یان هەر کەسێك لە نەریتی کۆن و شەرم لە خەڵك کردن و گیرۆدەیی ڕاهیکردن : ∴ ئەگەر چەند جارێك کچەکەت بەریتە نێو کۆڕ و برادەران لەو شەرمە ئازادی دەکەی . ٣ـ لێخۆشبوون : عافووکردن ؛ عەفووکردن ؛ لێبوردن ... بەخشین لە هەڵە و گوناه ( بـ . : ئازاکردن[٢] ؛ ئازاکرن : ئازایی[٢] ) . : (( پاش نوێژ ... هەر کەس کە دەستی یەکێکی تر ماچ ئەکا پێی ئەڵێ : گەردنم ئازاکە )) (سەججادی ، ل ٤٤) . ٤ـ مت . : تەلاقدان ؛ بەرەڵاکردنی ژن و وازهێنان لێی .

## ئازادی

(نو . ، نس . : ئازاد + ی) . (پە . : ئازاتیە) . ڕزگاری ؛ سەربەستی ؛ سەربەخۆیی ؛ ئازاهی ؛ ئازایی ؛ ئازادەگی ... بەندە و کوێلە نەبوون ؛ ژێردەستەی کەس نەبوون ؛ جڵەو بەدەست خۆوە بوون ... : ((داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ * سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ)) (بێکەس ، ل ٨٢) . ((هەموو عالەم لە دووی ئازادی وێڵە بۆچی من وەك شێت * کەمەندی زوڵفت لە ئەستۆی خۆم خەم و ببمە کەری ژێر بار)) (پیرەمێرد ، ل ٢١٨) . (کێ وا : لە ژێر زنجیرا * ئازادی هات بە بیرا)) (گۆران ، ل ٨٥) . ((ئاماد ، وەهار ، وەهار شادی * بۆی عەتر نەسیم غونچەی ئازادی)) (مەولەوی ، ل ٣٨) ... ~ ی بیر ؛ ~ ی قەڵەم ؛ ~ ی ڕامیاری ...

**ئازادیخوا**

(نك . ، ئنك . ) . (بـ . : ئـازادیخواز) . ((مـەرگ بـۆ ئیمپریالیست . ئەی بێگانـه بـۆ دەرەوە . بـا بڕووخێـت نۆکەرانی کۆمپانی‌یەکانی نەوت . بژی گەلانی ئازادیخوای جیـهان . بـا ببووژێتـەوە وڵاتـی ئـازاد و میللـەتێکی بەختیار)) (هیچ ، ل ٢٢٤) .

**ئازادیخواز**

(نك . ، ئنك . ، نس . : ئازاد + ی + خواز ((خواستن)) ) . ئازادیخوا ؛ ئازادخوا ؛ ئازادخواه ؛ ئازادخوەز ؛ ئازاخوەز ؛ ڕزگـاریخواز ... داواکـاری سەربەسـتی ... کەسـێ ، کۆمـەڵێ ، میللـەتێ مـەیل و ئـارەزووی ئـازادی هـەبێ ، یـاخود لـە پێنـاوی بیروبـاوەڕی ئـازادی و وەدی‌هێنـانی ئازادی‌دا خـەبات بکا : ((ئـازادیخواز ! گـری .. گـری .. * کەوتە ژێر پێی درنج ، پەری)) (گۆران ، ل ٢٣٦) .

**ئازادیخوازانه**

(ئـن . ، ئـك . ، نـس . : ئـازاد + ی + خـواز + انـه) . ڕزگاریخوازانه ؛ سەربەستیخوازانه ... ١ـ (ئن .) : ژیـان و کـار و کـردەوە و شـتێکی پێوەنـدی بـە ئازادیخوازییـەوە هـەبێ .٠. کـورد ژیـانێکی ئازادیخوازانـەی دەوێ . بەدەمەتـەقێی ئازادیخوازانـە گـەلێك کێشـە چارەسـەر دەکـرێ . بـیروڕای ئازادیخوازانـە لـە نـاو گـەلدا تـەواو

بلاوبووەتــەوە . مێــژووی بزووتنــەوەی ئــازادیخوازای نەتــەوەی کــورد زۆر کۆنــە ... ٢ــ ( ئــك . ) : بەچەشــنی ئــازادیخوازان ؛ وەك کەســانێك کــە ئازادییــان دەوێ : ∴ بلێیسـە ئازادیخوازانە بـیر دەکاتـەوە . کـورد ئازادیخوازانـە دەڕوانێتە چارەسەرکردنی کێشەکانی .

ئازادیخوازی

(نو . ، نس . : ئازاد + ی + خواز + ی) . ڕزگاریخوازی ؛ داواکــاریی سەربەســتی ؛ مــــەیل و ئــــارەزووکردنی ئــازادی ؛ لایــەنی ئــازادی گرتــن ؛ تــەرەفداری ئــازادی ؛ خــەبات و تێکۆشــان لــەپێناوی ئــازادی و ڕزگــاری و سەربەستیدا : ((زاهیدی ... بە پشتیوانی ئیمپریالیزمی ئینگلیس و ئەمریکا توانــی جووولانـەوەی ئـازادیخوازیی پەرەگرتوو و بەربلاوی ئێران سەرکوت بکا .)) (هێمن ، ل ٤١) .

ئازار[1]

(ن .) . (پە . : ئازار) . ١ــ ئێش ؛ ژان ... ئێــش و ژانــی ئەندامی لەش بە هۆی نەخۆشی و برینداریيەوە : ((سەری کاکە مەمی دەگرت ، داینا لەسەر ڕانیە * دەڵێ : ڕۆڵـە ، بەقوربانت بم کوێت دێشــێ ئــازارت چیــە ؟ * ڕۆڵـە چاکـە بابت ئازارت بزانێ)) (تحفە ، ب ١ ، ل ٢٤١) . ((بروسـکەی ئازاری باڵی بە هەموو لەشیدا پەرش بۆوە)) (ڕەئووف ، ل ٤٠) ... ٢ــ جەزرەبـە ؛ ســزا ... ئێــش و ژانــی ئــەنجامی

شتێکی ئازاردەر ، وەك : گەستن ؛ لێدان ؛ کەوتن ... : ((ئەو کوردانەی کە چەند مانگێ لەوە پێش لەشکری ئێرانێ ئازار و چەرمەسەرییێکی زۆریان دابوونێ ...)) ( دمدم ، ل ٢٦١ ) . (( دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە * بۆ دەعووەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا )) ( نالی ، ل ٨٤) . ٣- ئەزیەت ؛ ئەزێت ؛ عەزیەت ، عەزێت ؛ ڕەنج ؛ تەقەلا ؛ کۆشش ؛ هەولْ ، وەزەن ... ئێش و ژانێکی مرۆ پاش کارکردن و ماندووبوون هەستی پێ دەکا . ٤- پەژارە ؛ خەم ؛ خەفەت ؛ تالاو ؛ دەردەسەری ؛ ناخۆشی ... ئێش و ژانی دەروونی : ((کوشتەی نازی خۆت زۆر مەدە ئازار * زولفت نەبێتە پەرژینی ڕوخسار)) ( پیرەمێرد ، ل١٧٠ ) . (( محنەت و جەورا حەبیبێ * قەهر و ئازارا ڕەقیبێ)) (جزیری ، ل ٣٤٧) . تب . : زۆر جار لەگەلْ وشەی (ئازار)دا ، وشەی (ئێش ؛ ژان ؛ خەم ؛ دەرد ...)) دێت و دەوترێت : (ئێش‌وئازار ؛ ژان‌وئازار ؛ خەم‌وئازار ؛ دەردوئازار ...) ، وەك : ((نازانم چۆتە کام دێ ، کام هەوار * چۆن منی جێ‌هێشت بە ئێش‌وئازار)) (بەختیار ، ل ١٦٤) . ((ژان و ئازار پتر شالاویان بۆ ژنە هێنا ...)) (ژانی گەل ، ل ١١) . ((لە دنیای بێ بنی غەمدام ؛ سەرم سوڕماوە لەم کارە * کە دلْداری و شەرابی مەستی بۆ من دەرد و ئازارە)) ( ئیحسان ، ل ١٢ ) ... ~ ی دلْ ؛ ~ ی گیان ؛ ~ ی دنیا ... (بپرسن لەو دلەی نۆشی خەم و ئازاری دنیایە بپرسن لەو دلەی ڕشتی لە فرمێسك

خوێنی دەریایە)) (ئیحسان ، ل ١٦) ... بە ~ = بەژان : بەئێش ...

**ئازار[٢]**

( ن . ) ١ــ ئاهۆ ؛ پەتا ؛ درم ... نەخۆشیی گیرۆ ؛ نەخۆشیی ئادەمیزاد کە زوو تەشەنە دەکا و خەڵك زۆر دەکوژێ ، وەك : کۆلێرا ، تاعوون ... ∴ ئازار کەوتووەتە وڵاتەوە . ٢ــ دەرد ؛ قڕ ... ∴ مریشکەکان ئازاریان تێکەوتووە .

**ئازار[٣]**

( کژ . ) . ( ن . ) . ١ــ گریە ؛ کورك ؛ کورکە ... ٢ــ پرتەوبۆڵە ؛ هاوار ؛ قیژە ...

**ئازار[٤]**

(بـ . : ئادار) .

**ئازاراوی**

(ئن . ، نس . : ئازار + اوی) . (بـ . : ئێشاوی) . ((دوای حەوت ساڵی ئازاراوی * شەوی ماتەم و خەماوی)) (کامەران ، ل ٤٣) . (( ڕووداوی ناخۆش و پڕ بیرەوەریی ئازاراویی ڕابوردوو وەك پوورە هەنگ ورووژابوون)) (ژانی گەل ، ل ٧) .

**ئازارپیێگەیاندن**

( چ . ، تێ . ، نس . : ئازار + پیێ + گەیاندن ) . ( بـ . : ئازاردان ) .

**ئازارپیێگەیشتن**

(چ . ، تێن . ، نس . : ئازار + پیێ + گەیشتن) . ( بـ . : ئازارگەیشتن ) .

**ئازارچێژان**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئازار + چێژان ) . ( بـ . : ئازارخواردن ) . (( ئێستا فرمێسکی خوێنین ئەڕێژم * ئازاری زامی دەروون ئەچێژم )) (ژیر ، ل ۹۳) .

**ئازارخواردن**

(چ . ، تێن . : نس . : ئازار + خواردن) . هەست بە ئازارکردن ؛ هەست بە ئێش‌کردن ؛ هەست بە ژان‌کردن ؛ ئەزیەت‌خواردن ؛ عەزیەت‌خواردن ؛ عەزێت‌خواردن ؛ سزاخواردن ؛ خەفەت‌خواردن ؛ ئازارچێژان ... هەست بە ئازار و ئێش کردن چ لە ڕێی ئەشکەنجە و لێدان و چ بە تەنگپیێهەڵچنین و چ بە قسە و چ بە هەر شتێکی دی .

**ئازاردار**

( ئن . ، نس . : ئازار[1] + دار ) . ١ــ ئێشدار ؛ ژاندار ؛ خەفەتدار ؛ خەمدار ... کەسێك ئێش و ژان یاخود خەم و

خەفەتی هەبێ ((هاڕەی مێخەکبەن ، شەو لە خاوم کرد *
من چۆن ئازاردار ، ئەڵهای ئاوم کرد)) (زامدار ، ل ٥٩) . ٢ـ
بەئازار : بەئێش ، بەژان ... هەر شتێك بە ئێش و ئازار
بێت .

ئازاردان

(ژ . ، تێ . ، نس . : ئازار[١] + دان) . ئازراندن ؛
ئازارپێگەیاندن ؛ ئێشپێگەیاندن ؛ ئەزیەتدان ؛ ئەزێتدان ؛
عەزیەتدان ؛ عەزێتدان ؛ سزادان ... خەفەت کردنە دڵ ...
ئێش‌گەیاندن بە کەسێك چ بە ئەشکەنجە و لێدان ، چ بە
تەنگ پێهەڵچنین و چ بە قسە و چ بە هەر شتێکی دی .
((ئەوی سرتەشی لێوە بێ ، بڵێ هەژارم ، چم نیە ، کە
سەربازان وای وەبەر کوتەك و قامچیان دەدەن ئیدی
جارێکی دی بە خۆیدا نەیەتەوە ، ژنان ڕیسوا دەکەن ،
منداڵان دەکوژن ، پیر و کەنەفتان ئازاردەدەن ...)) (دمدم ،
ل ٥٥) . ((شاعیرێك ... لە یەکەم گرتنی‌یەوە تا ئازاردانی ،
هەڵواسینی ، تا پرس و لێکۆڵینەوە ... ئەو
زەردەخەنەیەی لەسەر لێوەکانی نەخش بوو تا تروسکایی
لە ژیانیا ما نەکوژایەوە)) (مستەفا ، ل ١٣٥) . ((ئەوانەی
بەندیخانەشیان بەدەستە لام وایە هەر بۆ تۆقاندن و
ئازاردانی خەڵك دایانناوە)) (ژانی گەل ، ل ٩٢) . ((پۆلیس
کە دەستی وە من ڕانەگەیشت کەوتە ئازاردانی بابم))

(هێمن ، ل ٤١) . ((پەلە پەل پەی زەوق زامیٚ وەتیرت * ئازاردابۆ تای زولف زنجیرت)) (مەولەوی ، ل ٧) .

**ئازاردەر**

( نك . ، نس . : ئازار[١] + دەر ) . ئازارپیٚگەیێن ؛ ئێشپیٚگەیێن ؛ ئەزیەتدەر ؛ عەزیەتدەر ؛ عەزێتدەر ؛ سزادەر ... کەسێك یان شتێك ، کە مایەی گەیاندنی هەر جۆرە ئێش و ئازارێك بیٚ . ((هێندیٚ جار هەڵدەکەویٚ کە مرۆڤ لە خەمدا کەیف دەکا و بۆ خۆی دەیکاتە یارییەکی ئازاردەر کە خوێنی دڵ دەخواتەوە)) (دایك ، ل ٣٢٠) .

**ئازاردراو**

( نب . ، ئنب . ، نس . : ئازار١ + د + ر + ا + و ) . ئازارپیٚگەیەندراو ؛ ئێشپیٚگەیەندراو ؛ ئەزیەتدراو ؛ ئەزێتدراو ؛ عەزیەتدراو ؛ عەزێتدراو ؛ سزادراو ؛ ڕەنجێنراو ؛ دڵ ڕەنجێنراو ؛ دڵ پڕ لە ژان کراو ... کەسێك ئەزیەت درابیٚ و ئازاری پیٚگەیندرابیٚ ، یان دڵی ڕەنجێنرابیٚ و دڵ پڕ لە ژان کرابیٚ .

**ئازاردیدە**

(ئن . ، نس . : ئازار[١] + دیدە ((چاو)) ) . کەسێك ئێش و ئازار و مەینەتی چەشتبیٚ ، واتە بە چاوی خۆی بینیبیٚ .

((لە شەقامی ڕەشیدا سەدان گەنجی خوێن گەرم و پیری ئازاردیدە ئاڵۆز و خرۆشاو ، دەماری گەردنیان خوێنی تێزابوو)) (هیچ ، ل ٢٢٤) .

**ئازارسی**

( سن . ) . ( ن . ، نس . : ئازار[1] + سی ) . ئازاری سی ؛ دەردەباریکە ؛ سیل ؛ دیق ؛ دیق وسیل ... ( بـ . : سیل ) .

**ئازارگەیشتن**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئازار[1] + گەیشتن ) . ئازارپێگەیشتن ؛ ئێش پێگەیشتن ؛ ئێش گەیشتن ؛ ئەزیەت پێگەیشتن ؛ ئەزێت پێگەیشتن ؛ ئەزیەت گەیشتن ؛ ئەزێت گەیشتن ؛ عەزیەت پێگەیشتن ، عەزێت گەیشتن ... پەیدابوونی ئێش لە لەش یان دەروونی کەسێکدا . ((فەن و فێڵت کەوتە دوو ئەی چەرخ لە لام ئابرووت تکا * بۆیە بەرزت کردمەوە بم خەیت و ئازارم بگا)) ( پیرەمێرد ، ل ٢٩٠ ) .

**ئازاکە**

(ل .) . (ن .) . جۆرە چێشتێکە لە ڕووەکی ئازیکە (بـ . : ئازیکە) و هەویرترش دروست دەکرێ .

**ئازاکردە**

( ل . ) . (بـ . : ئازادکردن) .

**ئازاکردن**[1]

( چ . ، تیَ . ، نس . : ئازا + کـردن ) . ١ـ پەلـەکردن ؛ خێراییکردن ؛ تالووکەکردن ؛ لـەزکرن ... گورج وگۆڵـی لـە ڕاپـەڕاندنی کارێکدا ؛ بەجیٚهێنانی کارێك بـە گورجـی ... ئازاکـە – خێراکـە ( خێرابکـە ) ؛ زووکـە ؛ گورجکـە ... ٢ـ ا ) بەجـەرگ کـردن ؛ جەسـوورکردن ... مرۆییێـك یـان گیانداریٚك پتەوکردن ... کەسێك یان گیانداریٚك لـە پێشدا گورج وگۆڵ و توند و تۆڵ نەبووە و دوایی ئەو خاسیەتەی پیٚ پەیداکراوە . خۆ~ – ا ) خۆ بە بوێر و ئازا و نەترس نیشاندان ؛ کەسێك خۆی بـە جوامێر و دلاوەر بخاتـە بـەر چاوی خـەڵك : ∴ هیچی لەدەسـت نایـە و خۆشـی لیٚمـان ئازاکردووە . ب ) خۆ توندکردنەوە ؛ خۆ گـورج کردنـەوە ؛ کەوتنە خۆ ...

**ئازاکردن**[2]

(چ . ، تـیَ . ، نـس . : ئازا + کـردن) . (بـ . : ئـازادکردن ٣ـ ؛ ئازاکرن ؛ ئازایی) . ∴ ڕۆژی جـەژن خـەڵکی گـەڕەك گەردنی یەکتریان ئازاکرد .

**ئازاکرن**

( کڕ . ) . ( چ . ، تیَ . ، نس . : ئازا[1] + کرن ) . (بـ . : ئازادکردن) . ((خۆرتا ، قیزا ، جاخلا ، زاڕە دکر گازی : *

سیابەند ئەم ئازاکرن ژ حەڕافباشی)) (چریکە ، ل ٦٠) .
((... من خوەست ئەز ئەوی ژ ماعریٚ ڕەش ، سەرگەنجۆر
ئازابکم)) (کوردۆ ، ل ٣٨) . ((... هەر کە من تو نەگرتی ،
ئەزیٚ تە ئازابکم و ...)) (کوردۆ ، ل ١٣٥) . ((ئێدی دەیکا
منیٚ گەردەنا من ئازا بکە ، عومریٚ من دونیاییٚ تمام
بی‌یە)) (بامەرنی ، ل ٤٣) . ((بەلکی ب نەسیحەت و ب
پەندیٚ * ئازا مە ب کەت ژ قەید و بەندیٚ)) (خانی ، ل
٢٨٤) ... ◊ گەردنا خوە ~ ...

### ئازاڵە

(سن .) . (ن .) . تەپاڵە ؛ ئێزنگ ... ڕەنج و شیاکە و
پشقلی وشکەوەبوو ، کە لە لادیٚ وەك سووتەمەنی
بەکاردێنریٚ و دەکرێتە سۆخت و ئاوردوی زستانە (بـ . :
ئێزنگ) .

### ئازانە

(بـ . : ئازایانە) . ((فەرمووی بە مژەی مەستی ، ئازانە و
تەڕدەستی * سادەی لە دڵی سستی ، تیریٚ ، بە
تەمەننایە)) (نالی ، ل ٥٦١) . ((ڕۆستەمی مازەندەران ئەو
وەقتە دەستی بردەوە * هاتە ڕێی (دێوی سپی) ئازانە
دەستی کردەوە)) (کۆیی ، ل ١٢٧) .

### ئازاو

(هـ .) . (بـ . : ئازاب) .

**ئازاهی**

(کژ.) . (بـ . : ئازایی) .

**ئازایانە**

(ئن . ، ئك . ، نس . : ئازا + ی + انە) . ئازانە ؛ بوێرانە ؛ دلێرانە ؛ مەردانە ؛ نەترسانە ... : ١ــ ئن . : کار و کردەوەییێك ئازایەتی و مەردایەتی تێدا بێ ∴ پێشمەرگەکان بە هێرشی ئازایانەیان کوردستانیان ڕزگارکرد . ٢ـ ئك . : أ ـ وەك کەسێکی بوێر و بەجەرگ ∴ پێشمەرگەکان لە سەنگەرەکانیاندا ئازایانە دەجەنگان . ((هاتم تێکۆشام ، وتم بەڵکو ئەم میللەتە بۆ خۆی هەناسەییێکی ڕەحەتی هەڵکێشێت سەربەست و ئازایانە بۆ خۆمان بژین و دەستی بێگانەمان بە سەرەوە نەبێ)) (لە خەوما ، ل ٥١) . ب ــ مت . : چالاکانە ؛ چاپووکانە ؛ بەگورجی ؛ بەگوڕی ؛ بەخێرایی ... بەجێهێنانی کارێك یان ئەرکێك بە خێرایی و گورج وگۆڵی ... ∴ شیروان ئازایانە وانەکانی ئامادە کرد . نەوزاد ئازایانە زەوی‌یەکەی کێڵا ...

**ئازایەتی**

(نو . ، نس . : ئازا[1] + ی + ەتی) . ( بـ . : ئازایی[1] ) . ((مێرخاسی وا هەبوون کە لەگەڵ خانۆدا ... لە نێو سوپای ئێران و ڕۆمێدا نێوبانگی ئازایەتی‌یان ڕۆیبوو)) (دمدم ، ل ٦٩) .

### ئازایی[1]

(نو . ، نس . : ئازا[1] + ی + ی) . ١ـ ئازاتی ؛ ئازاهی ؛ ئازایەتی ؛ بوێری ؛ جوامێری ؛ دلاوەری ؛ دلێری ؛ گەڕناسی ؛ مەردی . ∴ نەترسان لە کاتی مەترسیدا و خۆڕاگرتن لە دەمی ئێش و ئازار و بەسەرهات و کارەساتی ناخۆشیدا ((فیدای وەتەن و دڵسۆزی میللەت * نموونەی سەخا و ئازایی و غیرەت)) (پیرەمێرد ، ل ٣١٥) . (( گەر لە دنیا چاکەیێ صادر بو تەفرەی پێ نەخۆی * ڕووسپی هەر ڕووڕەشە گەر بێ صەد ئازایی بکا )) ( مەحوی ، ل ١٧ ) . ((ئازایی و مەردیی شێخی پاڵەوان * ئێستایش دیاری‌یە بەردە قارەمان)) (سەی وەهاب ، ل ٢٥) . (( لای لایێ ڕۆڵەکەم ، بە ڕۆح خزمەتت دەکەم * تا خزمەتی مەفتەن کەی بە ئازایی و چاپکی )) ( مەلای گەورە ، ل ٥٦ ) ... ٢ـ توانایی ؛ لێهاتوویی . ∴ (( سێ و چوار خۆش و سووکە * کوڕی زیرەك ئێسك سووکە * پێنج و شەش و حەوت بژمێرە * ئازایی خۆت دەرخە لێرە)) (بێکەس ، ل ٢٠١) .

### ئازایی[2]

گەردن ⌣ (بـ . : ئازادکردن[3] ؛ ئازاکردن[2] ، ئازاکرن) . ((ئەوا جەژنە هەموو کەس مەستی عەیشە و خۆشی‌یە و شایی * لە مل یەکدایە دەستیان بۆ ئصوولی گەردن ئازایی)) (باپیر ، ل ٦٢) .

**ئازەب**

(ئن .) . (ع .) . (بـ . : عازەب) . ((مەم نەهات ستی ڕابوو سەر لنگانە * بانکرە ئازەب و خولامان گیانە)) (مەمێ ئالان ، ل ١٤٧) .

**ئازابە**

(ن .) . (ع .) . (بـ . : عازەبە) .

**ئازەبەت**

(کئـ .) . (ن .) (ع .) . (بـ . : عازەبە) .

**ئازەبی**

(بـ . : عازەبی) .

**ئازەپ**

(ن .) . کۆیلەی بە دراو کڕاو : بەندەی زەرخڕی .

**ئازەخ**

(ن .) . بالووك ؛ بالووکە ؛ گەنمە ؛ گەندمە . ∴ زیپکە ئاسایی‌یێکی ڕەقی بێ ژانە لە دەست و پل دێت .

**ئازەر[1]**

(ن .) . (بـ . : ئاگر) .

**ئازەر[2]**

(ن .) . (ف .) . ( کئـ . ) . (پـھ . : ئاتور) . سەرماوەز ؛ قەوس . ∴ نۆیەمین مانگی ساڵی ئێرانی‌یە ، کە دەکاتە پایز .

**ئازەنتی**

ڕاژە ؛ ڕاڤە ؛ ڕاوە . ∴ مانا لێکدانــەوە ؛ شــیکردنەوەی واتا ... (بـ . : ڕاژە) .

**ئازەو**

(ل .) . (بـ . : عازەب) .

**ئازەوی**

(ل . ) . (بـ . : عازەبی) .

**ئازپێژ**

(کژ .) . (بـ . : ئاشپەز) .

**ئازپێش**

(کژ .) . (بـ . : ئاشخانە) .

**ئازپێشخانە**

(کژ .) . (بـ . : ئاشخانە) .

**ئازچی**

(ز .) . (بـ . : ئاشپەز) .

**ئازراحیل**

(کس .) . (بــ . : ئـیزرائیل) . ((ئـازراحیل و جـبراحیل ، ((هەردوو ملیاکە تی ڕەببیێ عەلامیێیـە * ژ عـەزمانیێ ژۆری نازل بوونە عەردیێیە)) (زارگۆتن ، ل ١٨٣) .

**ئازراندن**

(بـ . : ئازاردان) .

**ئازری**

برینی کێم تێزاو ؛ برینی بە چڵك و کێم و هەوا .

**ئازگار**

(ل .) . تـەواو ؛ ڕەبـەق ؛ سـەرلەبەر ... یـەك دوای یـەك ؛ بێ زیاد و کەم ... بە دوایەکدا هاتنی ڕۆژ یان مانگ یان ساڵ بێ نێوان و پچڕان . ((... هـەر لـەم بارەگایـەدا چـل ڕۆژی ئازگار لێیکەوت)) (پاشا ، ل ٥٢) . ∴ شەش ساڵی ئازگار نەخۆش بوو .

**ئازما**

( ئسـت . : ئایزمـا ) . ئـەزموون ؛ تاقیکردنـەوە ؛ تەجروبەکردن ... (بـ . : ئـەزموون) . ((مـەرد ئازما هـەن پـەرێ خائیفان * هەردەم بە ڕەنگی وێش مەدۆ نیشان)) (هەمەوەند ، ل ١٤٨) .

**ئازمان[١]**

(کژ .) . (بـ . : ئاسمان) .

**ئازمان[٢]**

(کژ .) . (بـ . : زمان).

**ئازمووده**

( فک . ) ، ( نب . ) . تاقیکراوه ؛ تەجرەبەکراو ؛ بەتەجرەبە ؛ بەئەزموون ؛ خەبەردار ... ((وتووێژی نالی لەگەڵ دەشت و دەر و گیا و گوڵ و ئاژەڵدا لە هی مرۆڤێکی لادێیی ئازمووده دەکا ، نەك بویژێکی خەیاڵبان)) (مەسعوود ، ل ١٥٠) .

**ئازنا**

(د .) . (ب . : مەلە ؛ ئاژنە) .

**ئازنگ**

(ن .) . ١ـ خانووی بەسەر تەختەبەردی پانەوە دروست کراو . ٢ـ تەنیاماڵ ؛ تاقەخانوو ؛ تەنهاخانوو ...

**ئازوباز**

( ن . ، نس . : ئاز + و + باز ) . ئازوبەزە ؛ ئۆباڵ ؛ هۆباڵ ؛ وەباڵ ؛ تاوان و گوناح ... بۆ پاکانەکردن و ڕەواندنەوەی گومان و تەئکیدکردن لە بەرپرسیاریی کار و کردەوەو قسەیێك بەکاردێنرێ : ∴ ئازوبازت بە گەردنم ئەگەر لە بیرم کردبێ . ئازوبازت بە ملم ئەگەر هیچی خراپم وتبێ . ئازوبازت بە ئەستۆم یەکجار جوانی ... ◊ ئازوبازی تۆم بە مل = ئۆباڵت بە گەردنم ؛ گوناحت بە ئەستۆم ؛ ئازوبەزەت بە ملم ...

**ئازوبەزە**

(ن . ، نس . : ئاز + و + بەزە) . (بـ . : ئازوبان) .

**ئازوخ**

(کس .) . (ن .) . ١ـ خواردەمەنی ؛ ٢ـ ئازوبان) .

**ئازوردە**

(فك .) . تێکچوو ؛ شێواو ... ((کەسی من گەر کەسن ، کەس من نەخاتە فکری ئەو شاهە * بەیادی ناکەسان ئازوردە حەیفە خاطیری عاطیر)) (مەحوی ، ل ١٢٧) . ((قەت نەبووە شەوێکی بە غەمی کۆنەوە بنووم هەر صبحدەم ئازوردەیی تازە ستەمێکم)) (ئەدەب ، ل ٥٦) .

**ئازۆخە**

(بـ . : ئازووخە) . ((ئەهلی ئەو ئاواییەش کە دێن بۆ ئەم پرسەیە هەر شوێنە بە ئەندازەی خۆی لە مەڕ ، لە برنج ، لە ڕۆن ، لە ئازۆخەی تر چی ڕێبکەویٚ لەگەڵ خۆیان ئەیهێنن بۆ ماڵی ئەو مردووە)) (سەجادی ، ل ٣٢) .

**ئازۆخەخستن**

(بـ . : ئازووخەخستن) .

**ئازۆخەداخستن**

(بـ . : ئازووخەداخستن) .

**ئازوو**[1]

(کژ.) . (ب. : ددان) .

**ئازوو**[2]

(کژ.) . (ب. : ئازی ؛ تف) .

**ئازووخە**

( ن. ، نس. : ئاز + ووخە ) . (ئست. : ئازووئیتی ؛ ئازووتی ؛ - چەوری ، خواردەمەنی) . ئازۆخە ؛ ئازووقە ؛ تفاق ؛ زەخیرە ... کەرەستەی پێویستی خواردەمەنی و بژێوی ، کە دەکرێنە زەخیرە ((سەرەڕای ئەم پەشێوی‌یە ، ئەو ئازووخەیەی لەگەڵ گیانیان دەربازیان ئەکرد ، تورکەکان لێیان ئەساندن)) (خواجە ، ل ١٢) . ((کاروانی قەڵای دمدم بەرەو شەمدینان بەڕێکەوت ، چوو لەوێ ئازووخە بکڕێ)) (دمدم ، ل ١٥٥) .

**ئازووخەخستن**

(چ. ، تێ. ، نس. : ئاز + ووخە + خستن) . ئازۆخەخستن ؛ ئازۆخەداخستن ؛ ئازووخەداخستن ؛ ئازووقەخستن ؛ ئازووقەداخستن ... تفاق کۆم کردن ؛ دابین کردنی بژێوی و عەمبارکردنی .

**ئازووخەداخستن**

(چ. ، تێ. ، نس. : ئاز + ووخە + دا + خستن) . (ب. : ئازووخەخستن) .

**ئازووقە**

(ن . ، نس . : ئاز + ووقە) . (بـ . : ئازووخە) . ((دوکانی ئازووقە و دانەوێڵە فرۆشتنیش هەبوو)) (دمدم ، ل ٣٤) . ((منی دەگەڵ حەسەن پاشای میری میرانی شامیّدا ناردە تفلیس و گورجستان کە ئازووقە و خەزنە بەرین)) (شەرەفنامە ، ل ٧٨٤) . ((ماڵەکەی گشت یەق ئەداتەوە لە دانەوێڵە و ئازووقە)) (بابان ، ل ٤) .

**ئازووقەخستن**

( چ . ، تیّ . ، نس . : ئاز + ووقە + خستن ) . (بـ . : ئازووخەخستن) .

**ئازووقەداخستن**

(چ . ، تیّ . ، نس . : ئاز + ووخە + دا + خستن) . (بـ . : ئازووخەخستن) .

**ئازیەت**

(بـ . : ئازێت) .

**ئازیەتبار**

(ئن . ، نس . : ئازیەت + بار) . تازیەدار : ماتەمین ... خەمباری خۆشەویست مردوو : کەسێکی مردووی لیّ مردبیّ . (( تۆ سەنگ کۆنی ، یە کام هەوارەن یە پەی کیّ ڕەنگت ئازیەت بارەن ؟ )) (وەلیی دیّوانە ، ل ٥٢) .

**ئازیەتباری**

(نـچ . ، نـس . : ئازیــەت + بـار + ی) . تازیــەداری : ماتەمینی ... لە بارودۆخی تازیەدا بوون .

**ئازیەتی**

(ئن . ، نس . : ئازیەت + ی ۳ـ ) هەر شتێك پێوەندی بە تازیەوە هەبێ .

**ئازێت**

(ن .) . (ع . : عزاء) . ئازیـەت : پرسە : بەهی : تازیـە : تازیمانـە : ماتـەم : سەرەخۆشـی ... ((ئازێت وەیشوومەی پار و ئەم وەختە * توێژی نەبەستووە ئەو زامـە سـەختە)) (مینە جاف ، ل ۱۰۲) .

**ئازی**

(کس . ) . (ن) . (بـ . : تف) . ((ڕاسـت ژ پادشاڕا بێژە ، لێ پادشـێ خێنجـی ئازییـا سـەر زمـانێ وی تـو تشـتی نەخوازە بێژێ ئەز دەخـوەزم ، کو تـو ئازییا زمـانێ خـوە بکی دەڤێ من)) (کوردۆ ، ل ۳۹) .

**ئازیز**

(ئـن . ) . (ع . : عزیـز) . عـازیز : عـەزیز : خۆشەویسـت ... ( بــ . : عـازیز ) . (( مـیر دەڵـێ : بەنگینـە ئـازیزم ، بەنگینێکی شیرینی ! * ئەسپان بێنە دەرێ ، سواربن بچنە

کن کاکە مەمیماڵە قەرەداژەدینیٚ )) (تحفە ، ب ١ ، ل ٣٠٨) . ((وەزیر گوتی : میوانانی ئازیز ، شا کەمیٚ سەغڵەتە ... تەشریفی پشوویەك دەدا ، دیسان تەشریف دێنێتەوە)) (دمدم ، ل ١٠١) . ((خەتای من نییە ، خەتای پایزە * ڕەنگ زەردییەکەم ، دووریی ئازیزە)) (زامدار ، ل ١١٩) . ((ئازیز ، وە مەرگت گەر ئینسافت بۆ * هەنی کافی‌یەن بۆی زوڵفت پەی تۆ)) (مەولەوی ، ل ١١) .

**ئازیزە**

(ن . ، نس . : ئازیز + ە) . ناوی مەقامێکی کۆنی کوردی‌یە .

**ئازیزمەردە**

(بـ . : ئازیزمردە) . ((ئەم بیٚ ڕەنگی‌یە ، بەم قەوزەی سەردە * ئەم مەلوولی‌یە وەك ئازیزمەردە)) (پیرەمێرد ، ل ١٥١) .

نەل ، ل

**ئازیزمردە**

(ئن . ، نس . : ئازیز + مرد + ە) . ئازیزمەردە ؛ خۆشەویست مردوو ... بە کەسێك دەوتریٚ خۆشەویستێکی مردبیٚ و لە خەم و ماتەمی ئەودا بێت . ((شەرتە وەك ئازیزمردە سەر لە ئەژنۆ بەرنەدم * بۆ دڵەی ویٚڵ و غەریبم دائیما بگریم بە زار)) (ئەخۆل ، ل ١٨) .

**ئازیکه**

(ل ٠) ٠ (ن ٠) ٠ ڕووەکێکی دڕکاوییه ٠

**ئاژ[١]**

(ئن ٠) ٠ زبر؛ زوور؛ نەپۆر ... × ساف؛ لووس ... (بـ ٠ : ئاژین) ٠

**ئاژ[٢]**

(ل ٠) (ن ٠) ٠ ڕووی کلاش ٠

**ئاژار**

( کژ ٠ ) ٠ ( ن ٠ ) ٠ ١ـ بەرهەم و دەرامەتی زەوی و زار؛ پیت و بەرەکەتی زەوی ٠ ٢ـ زەوی؛ زەمین؛ خاك؛ مەزرا؛ کێڵگه ...

**ئاژارۆکێ**

(ئن ٠) ٠ (کژ ٠) ٠ لەڕ؛ لاواز؛ کز ... (بـ ٠ : لاوان) ٠

**ئاژاژك**

(بـ ٠ : باوێشك) ٠

**ئاژاژکی**

(ل ٠ ) ٠ (بـ ٠ : باوێشك) ٠

**ئاژاژکیکرده**

(ل ٠) ٠ (بـ ٠ : باوێشك دان) ٠

**ئاژاژی**

(بـ . : باوێشك) .

**ئاژاڵ**[1]

(ن .) . ئاژەڵ ؛ ئاژێڵ ؛ پاتاڵ ؛ وڵست ؛ وڵسات : ماڵات ؛ مەڕوماڵات ؛ گاوگۆڵ ؛ گاوگۆتاڵ ؛ حەیوانات : دەوڵەت ...
((لەو کاتەدا کە ئاژاڵ لە لەوەڕ دێنەوە بۆ ناو دێ ...)) (بابان ، ل ٢٧) . ((لە کوردەواری ئاژاڵ بە شەو لە کەژایە ، شوان ئەیداتە پێش و بە دەم لەوەڕەوە ...)) (سەجادی ، ل ١٥٣) . ((گا و گوێرەکەی سەرەڕۆ * ئاژاڵی زیانە خرۆ)) (گۆران ، ل ٤٢٨) ...~ ی تەڕەزەن - حەیوانی تازە زاوی زۆر شیردەر . ~ی دۆشانی ( دۆشەتی ) - حەیوانی شیردەر ، کە بۆ دۆشین دەست دەدا .

**ئاژاڵ**[2]

(ن .) . ١ـ گیا ؛ سەوزەگیا ؛ گژوگیا ... ٢ـ پوش وپەڵاش ؛ پڕوپووش ؛ دڕك وداڵ ... ٣ـ چڵ وچێو ؛ چیلکەوچاڵ ؛ چڕوچیلکە ؛ وردەدار ...

**ئاژاڵدار**

( ئن . ، نس . : ئاژاڵ + دار ) . ئاژەڵدار ... خاوەن ئاژاڵ ؛ خاوەن پاتاڵ ؛ خاوەن وڵسات ؛ خاوەن مەڕ و ماڵات ... بە کەسێك یان لایەنێك دەوترێ خاوەن مەڕوماڵات بێ .

**ئاژاڵداری**

( نـچ . ، نـس . : ئـاژاڵ + دار + ی ) . ئـاژەڵداری ... حەیوانڕاگری ؛ ماڵات بەخێوکەری ... کار و پیشـەی ئەو کەسەی مەڕوماڵات بەخێودەکا .

**ئاژان**

(کئـ .) . (ن .) . (فر .) . پاسـەوان : پۆلیـس ؛ قۆڵچـی ؛ دارغـه ؛ داروغـه ؛ یاسـاوڵ ... ((ئـاژان وەکـو سـەگی هـار دەخولێنەوە لەناو شار)) (هێمن ، ل ٩٨) .

**ئاژانخانه**

(کئـ .) . (ن . ، نس . : ئاژان + خانه) . (فر . ك .) . (بـ . : پۆلیسخانه) .

**ئاژانس**

(ن .) (فر .) . (( من ئاژانسـی دەنگوبـاس نیـم کـە بێـم بـۆ لات خـەبەربـەرم * من دێـم قـەندی لێوت بخۆم لـە باخـانت سەمەر بەرم)) (قەرەداغی ، ل ٦) .

**ئاژاوه**

(ن .) . ١ـ ئاژاوله ؛ ئاژاوڵه ؛ ئاشووب ؛ ئاشۆ ؛ ئاشێو ؛ پشـێونه ؛ پشـێوه ؛ پشـێوی ؛ پەشـێو ؛ شـێواوی ... شێواوی و پشێویی شار یا وڵاتێـك ، کـە هـەر کەسـە بـە ئارەزووی خۆی هـەرچی ویستی بیکا ، بـێ ئـەوەی گـوێ بداتە یاسا ... ((پیری عەرزوحاڵی داوه * ئـەمڕۆ کەوتۆتـه

ئاژاوە)) (گۆران ، ل ٣٧٧) . ٢ـ شەڕوشۆڕ : شەڕوکێشە : کێشەکێش : ڕاوەدوو ... کاری بەگژیەکداچوون و تێک بەربوونی خەڵکی شوێنێکی دیاریکراو (ناوچە ، شار ، گوند ، گەڕەك ، گوزەر ، مال ...) . ((کچان هەوێنی ئاژاوەن * لای خۆیان وایە بەستراوەن)) (مەدهۆش ، ل ٢١٩) . ٣ـ هەرا : هەراهەرا : هەراوزەنا : هەراوهوریا : قاوەقاو : قیرەقیر ... کاری تێک بەربوون و بەگژیەکدا چوونی منداڵانی ماڵێك یان کۆڵانێك یان گەڕەکێك .

### ئاژاوەبەرپاکردن

(بـ . : ئاژاوەنانەوە) . ((هەرگیز ... هەرگیز ڕێگە نادەین ئەو ئاژاوە بەرپابکات)) (ڕوبار ، ل ١٤٠) .

### ئاژاوەتێخستن

(چ . ، تێ . ، نس . : ئاژاوە + تێ + خستن) . سازکردنی ئاشووب و شەڕوشۆڕ و هەراوهوریا لە شوێنێك یان نێو کۆمەڵێك . ∴ ئەم شارە وەك ماستی مەیو وابوو ، ئەو خوێڕییانە ئاژاوەیان تێخست . ئەم لاوانە وەك برا وابوون ، کەچی ئازاد ئاژاوەی تێخستن . ماڵی مام نەریمان زۆر ئارام بوو ، نازانم کێ ئاژاوەی تێخست ؟ ...

### ئاژاوەچی

(نك . ، نس . : ئاژاوە + چی) . ( بـ . : ئاژاوەگێڕ ) . ((دوای چەند ڕۆژێك دەریاوانەکە بە ئەمەی زانی ، بە

زەبروزەنگەوە دەستی لە ئەم ئاژاوەچییانە وەشاند)) (خەندەلێو ، ل ٩٣) . ((کافر ... ئاژاوەچی ... بۆچی دێیتە ئێرە)) (دایک ، ل ٨٠) .

**ئاژاوەخستنەوە**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئاژاوە + خستن + ەوە) . ( بـ . : ئاژاوەنانەوە ) .

**ئاژاوەکوژانەوە**

( چ . ، تێن . ، نس . : ئاژاوە + کوژان + ەوە ) . دامرکانەوەی ئاشووب و پشێوی ؛ هێوربوونەوەی شەڕوکێشە ؛ خامۆش بوونەوەی هەراوهوریا ؛ نەمانی شەڕوشۆڕ ... (( لە پاش ئەوەش کە بەغدا ئاوەدان کرایەوە و ئاژاوە کوژایەوە ، ژیانی تێدا بووژایەوە)) (شەرەفنامە ، ل ٩٥) .

**ئاژاوەکوژاندنەوە**

(چ . ، تێ . ، نس . : ئاژاوە + کوژ + اندن + ەوە) . دامرکاندنەوەی ئاشووب و پشێوی ؛ هێورکردنەوەی شەڕوکێشە ؛ خامۆش کردنەوەی هەراوهوریا ؛ نەهێشتنی شەڕوشۆڕ ...

**ئاژاوەگێڕ**

(نك . ، نس . : ئاژاوە + گێڕ ((گێڕان)) . ١ـ ئاژاوەچی ؛ ئاشووبگێڕ ؛ کەتن گێڕ ؛ سەرەسۆدرە ... یەکێك

ولآت بشێوێنیٚ ... ٢ـ شەڕهەڵایسێن ؛ شەڕهەڵخرێن ... کەسێك مایەی شەڕنانەوە بیٚ ... ٣ـ سەربەگۆبەند ؛ سەربەگێچەڵ ... ئەو کەسەی هەرا دەنێتەوە .

ئاژاوەگێڕان

(چ . ، تیٚ . ، نس . : ئاژاوە + گێڕان) . (بـ . : ئاژاوەنانەوە) .

ئاژاوەنانەوە

( چ . ، تیٚ . ، نس . : ئاژاوە + نان + ەوە ) .
١ ـ ئاژاوەگێڕان ؛ ئاژاوەخستنەوە ؛ ئاژاوەبەرپاکردن ؛ ئاشووب گێڕان ؛ کەتن گێڕان ... بەرپاکردنی ئاشووب ؛ سازکردنی ئاژاوە ... ٢ـ شەڕوشۆڕنانەوە ؛ شەڕهەڵگیرساندن ؛ شەڕبەرپاکردن ؛ شەڕهەڵخراندن ... هەڵگیرساندنی شەڕوشۆڕ ... (( لەوە پێش لە سۆنگەی ئاژاوەنانەوەدا ... گرتیان )) ( شەرەفنامە ، ل ٥٨) . ٣ـ هەرانانەوە ؛ گۆبەندنانەوە ... نانەوەی هەرا و گێچەڵ ((لە هەر کویٚ بم من ئاژاوە دەنێمەوە)) (هەڵمەت ، ل ١١٠) .

ئاژاولە

(بـ . : ئاژاوڵە) .

ئاژاوڵە

(ن .) . (سن .) . (بـ . : ئاژاوە) .

**ئاژەڵ**

(ن . ) . (بـ . : ئاژاڵ)

((لە شاردا گەلێ گوزەر و شارێ هەبوون ، جگە لە دوو بازاڕ مەیدانێکی ئاژەڵیشی تێدا بوو)) (دمدم ، ل ٣٣) . ((هەندێ جێگای حەسانەوەیان بۆ شوانان بە چەپەر و تەیمان دروست دەکرد ، هەندێکیشی کۆنە ئولکیان بۆ ئاژەڵ نوێ دەکردەوە)) (دمدم ، ل ٢١٤) . ((بە سۆزی زریان پیاوی دەکەی سڕ * بە کڕێوە و باکوت ئاژەڵ دەکەن قڕ)) (هێمن ، ل ٧٥) . ((شوان دەمرێ و ئاژەڵ زاوزێ دەکا)) (پێنجوینی ، ل ٤٠) .

**ئاژەڵانە[١]**

(ئك . ، نس . : ئاژەڵ + انە) . بە چەشنی ئاژەڵ ؛ وەك ئاژەڵ . ((... ژنانی ئاسك ئاوڕ و والاّ مەقیان بە شێوەیەکی ئاژەڵانە بە تالاّن بردووە و کردووەتە باوەش)) (کوردۆ ، ل ٢٠٠) .

**ئاژەڵانە[٢]**

(ئك . نس . : ئاژەڵ + انە) .

باجی ئاژەڵ .

**ئاژەڵدار**

(ئن . ، نس . : ئاژەڵ + دار)

(بـ . : ئاژەڵدار) .

**ئاژەڵداری**

(نچ . ، نس . : ئاژەڵ + دار + ی)

(ب . : ئاژاڵداری)

((بە کاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کارامە ببووم))

(هێمن ، ل ١٥) .

**ئاژدا**

(ن . ع .)

(ب . : ئاژداد) .

**ئاژداد**

(ن .) (ع . : أجداد ، جدّ) .

- ئاژدا ، ئەژداد ، ئەجداد ، باووباپیر ، باووباپیران ، باپیران ...

(( وەتەنی من کوردستانە * یادگاری ئاژدادمانە ))

( زێوەر ، ل ١٤ ) ... ئاژداد و ئاباد : ... (( سەریان بە گۆڕی ئاژداد و ئابادیان )) (ژانی گەل ، ل ٧٣) .

**ئاژر**

(ن .) . ڕك ، ڕق ، تین ، کینە ، تووڕەیی ، قەڵس .

(ب . : ڕك) .

**ئاژری**

(ئن .) ، بەڕك ، ڕقهەڵستاو ، تووڕە .

**ئاژن**

(ڕك .) : ئاژنین

بەتەنیا بەكار نایەت . بە دوای ناوەوە دەلكێ و : ١ـ خەسلەتی بەركاری پێكدێنێ : (دەرزیئاژن ، سوژن ئاژن ...) و واتای : أ) زۆر تێچەقاندن :

((دڵ كون كون ئەكا وەك سووژن ئاژن * چاو ڕوانیمان بێ بە كوێریی دوشمن)) (پیرەمێرد ، ل ١٥٢) ... ((ئەوەتا تلاوتلت پێكەوت و سەرین سەرت ڕاناگرێ ... پێخەف وردە وردە كەوتە دەرزیئاژن كردنت)) (ڕەئووف ، ل ٦٠) ... (( توند بە سنجاق دەرزیئاژن ئەكرێ )) ( كوردواری ، سەججادی ، ل ١٢٥ .

ب) كۆڵینەوەی ددان بۆ پاككردنەوەی لە وردە گۆشت و ...

ج) ناوی ئامێر سازدەكا ، ددانئاژن ...

**ئاژنە[1]**

(ن .) : چەكۆشی نەقاڕی ؛ چەكوشی بەرد چاككردن ؛ چەكوشی بەرد شكاندن .

**ئاژنە[2]**

(د .) . (ن) .

(بـ . : مەلە ، ئازنا) .

**ئاژن‌کردن**

(چ . نی . تێ .) : دابەشکردنی ئاو لە جۆگەی گەورەوە بۆ ناو دێراوی کشتوکاڵ و شیناوەرد .

**ئاژنی[1]**

(نـچ .) : مەلـەوانی ، مەلـەڤانی ، سـۆباری ، سـۆبایی ، سۆباهی .

(بـ . : مەلەوانی) .

**ئاژنی[2]**

(بـ . : ژین) .

**ئاژنی‌کردن**

(چ . نس . تێن .)

(بـ . : مەلەکردن) .

**ئاژنین[1]**

(چ . تێ .) : نەشـتەر و درەوشـە و سـووژن و چیلکـە و پـروش و هـەر ئـامێرێکی دی نـووک تیـژ چـەند جـار بـە شتێکدا کردن و دەرهێنانەوەی .

:: بە نەشتەر گشت لەشیان ئاژنی

:: هەر خەریکی ددان ئاژنینە

((دەستە ڕەقەکانی ماندوو ببوون ، ئیتر وازی لە چیلکە ئاژنینی خۆڵەکە هێنا)) (قزلجی ، ل ١٥)

ئاژنین[2]

(چ .) ، (تـیٚ .) : داخسـتن ؛ دەرگـا ... گرتـن ، (کەلەبــەر) ... ئەو دەرگایە ئاژنە .

ئاژنین[3]

(چ .) . (تـــیٚ .) : داکـــەندن (جل وبـــەرگ) ؛ خـــۆ ڕووت کردنەوە ـ کراسەکەم ئاژنی .

ئاژنین[4]

(چ .) ، (تـیٚ) : زبرکـردن ، زرب کـردن ، کونجـڕ کونجـڕ کردنی بەرداش .

ئاژنین[5]

(چ .) ، (تیٚ) : توورەکردن ، ڕق هەڵستان .

ئاژۆ

(ن .) : ١ـ لیٚخوڕ ، شۆفیٚر ، هاژۆ ، هـاژۆر ... کەسـیٚ کە بارەبەر ، یاخود ئوتومبیٚل لیٚدەخوڕیٚ . ٢ـ کاری شویٚن پیٚ هەڵگرتن : شویٚن پیٚدۆزی ؛ دەوس دۆزی ؛ شویٚن گیٚڕی : ئۆپاژۆیی : دانەپەی ... ٣ـ نك لیٚبوونەوەی ڕیشە .

ئاژۆتن

(چ . ، تیٚ . ، کژ) : ئاژوان ، ئاژووتن ، هاژۆتن ، ڕانـدن ، لیٚخوڕیـن ... ١ـ لیٚخوڕینـی ئەسـپ و هـــەموو جـۆرە ولاٚخ و گیاندارێك . ((ل هەسپیٚ سیار بو ، بەیتەکە قورئانی خاند

ئاژۆت بەر ب کایینا نەزروانیێ چوو)) (سیابەند ، ل ٥٤) .
١- ((لغاوی ئەسپەکەی لە کەفا نوقم ببوو . یەکسەر بەرەو
کن کویخای ئاژوا (تەنەکە ، ل ١١٧) ... ٢- لێخوڕینی
ئوتومبیل و تراکتۆر و کەشتی و هەموو جۆرە ماشینێکی
دی : ◊ زەڤیێ ~- زەوی کێلان ◊ جڤات ژ سێ سەهاتان
بێتر ئاژۆت بوو - کۆبوونەوە سێ سەعات پتر دەوام بوو
(خایاند) .... ٢- ((هەر ئێستا ڕەوتی کەشتییەکە بەرەو
ڕۆژئاوا هەڵبچەرخێنە ... بێتو بەرەو ڕۆژئاوا بیئاژۆیێن
بەرپەرچی بایەکە دەدەینەوە ( خەندەلیۆ ، ل ١٦ ) .
٣- پێش خۆدان : بۆ پێشەوە ڕادان ؛ خستنە سەر
ڕێ ؛ یخ کردن ( مەڕ و بزن و ... ) . ٤- بەڕێوەبردن ؛
سەرکردایەتی کردن ؛ فەرمانداری کردن . ٥- تووڕهەڵدان ؛
فڕێدان ... ((دەستەشۆر ئاژۆتنە ئاڤێ)) (بامەڕنی ، ل
١٤٤) . ((خوە ئاژۆتن)) : پەلاماردان ، هەڵمەت بردن ،
هەڵکوتاندن ، شالاوبردن ، هێرش بردن . ((ئاژۆتن سەر
(ئاژۆتنە سەر) ؛ هەڵمەت بردنە سەر : هەڵکوتانە سەر ؛
شالاو بۆ هێنان . (( ئاژۆتن ناڤ (ئاژۆتنە ناو) : ڕاندن ،
وەدەرنان ، دەرکردن : ((حەیوان ئاژۆتنە ناڤ شەت))
(مەمێ ئالان ، ل ٦٦) . (مت .) : خێراڕۆیین ؛ بە
پەلەڕۆیشتن ((ئاژۆتنە بازاڕێ ئەداتێ)) (ستران ، ل ٧٦) .

**ئاژۆتی**[1]

(نب .) : ١- لێخوڕدراو ؛ لێخوڕی . (بـ . : هاژۆتی) .

**ئاژۆتی**[2]

(نب .) زەویی کێڵراو

**ئاژۆدان**[1]

(چ . نس . تیَ .) (ئاژۆ + دان) .

شەوبەکێو ؛ شەوئاژووکردن ؛ بە شەو بردنی مێگەل بۆ لەوەڕ ؛ لەوەڕاندنی شەوانەی ئاژەڵ لە کێو . :: ئەوە هەفتەیەکە ڕانەکە ئاژۆدەدەین .

**ئاژۆدان**[2]

(چ . نس . تیَ .) : (ئاژۆدان) .

شەبەیخوون بە پەلاماری شەوانە بۆ سەر دوژمن ؛ هێرش بردنە سەر دوژمن لە شەودا ...

**ئاژۆکردن**

(چ . نس . تیَ ) : (ئاژۆ + کردن) .

شوێن پیَهەڵگرتن ؛ وەدواکەوتن ، شوێن پیَدۆزی کردن ؛ دەوسی دۆزی کردن .

**ئاژوو**[1]

(بـ . : ئاژۆ) .

**ئاژوو**[2]

(ن .) . ئالیك ، ئالك ، دیزی ، کاوجۆ ، گژوگیا .

**ئاژووان**

(تیٚ .)

(ب . ئاژۆتن)

((هەمزەچاوەش ئاژوای، سەلەفێك بە تاو دوورکەوتەوە، پاشان بە تاو گەڕاوە . ئەم سوارچاکە لەگەڵ تاودانی ئەسپ ...)) (دمدم ، ل ٦٥) . ((لەشکر ئاژاوی بە مەخسووسی * لە خاکی موکری دەپرسی)) (تحفە ، ل ٢٠٦) ؛ ((هەتا ئێواریٚ دەی ئاژوا ، ئێواریٚ مەنزڵی دەگری)) (ل ٢٠٦) .

**ئاژێڕ**

( ن . ) : شووت ، دەنگی کارخانە . (( لە گەڕەکی بە سام و پڕ دووکەڵی کرێکاراندا ، هەموو ڕۆژیٚ دەنگی دڵتەزێنی ئاژێڕی کارخانە ولاٚتی دەلەرزاند )) ( دایك ، ل ٩ ) .

**ئاژێڵ**

(ب . : ئاژاڵ) .

((سەیرکە ڕۆڵە بیٚبارانی چی پیٚکردین ؟ دڵ و دەروون سووتاو ، ئاژێڵ بیٚ لەوەڕ ...)) (هیچ ، ل ٣٤) .

## سوپاس و پێزانین

دوای ئەوەی بڕیارم دا ، ئەو (١٠٣) لاپەڕەیەی (١٠) ساڵێك لەمەوبەر لە ((فەرهەنگی میدیا)) پاکنووسم کردبوو ، با کەمیش و سەدی پێنجی فەرهەنگەکە بێ کۆمپیوتەر بکەم و بیخەمە بەر دیدەی خوێنەری هێژا ، یەکەندەردوو د. محەمەد حسێن زەهاویی خوێندکار و هاوڕێ و برای فرە خۆشەوێت و دڵسۆزم پێی ڕاگەیاندم ، کە خۆبەخشانە و بە دڵ و بە گیان کاری کۆمپیوتەرەکە دەگرێتە ئەستۆی خۆی ... بڕواتان بێ ڕازی و قایل نەدەبووم ، کە ڕاگری کۆلێژێك و کەسێکی هێندە سەرقاڵ بە کاروباری ئەو کۆلێژەوە ، شەونخونی بۆ من بکێشێ ... بەڵام :

١ـ نەم دەتوانی پەشیمانی بکەومەوە ، کە ئەو ئەرکە قورس و گرانە نەگرێتە ئەستۆ و لەو بەلایە مەرەخەسی بکەم .

٢ـ دەمزانی کۆمپیوتەرکردنی ئەو نووسینە بەو وردی و هەموو هیما و نیشانانەوە ، بەو نەبێ ، بە کەسێکی دی وا جوان و ڕەنگین و بێ هەڵە ئەنجام نادرێ .

کوردانە و گوردانە خۆی خستە ژێر باری ئەو ئەرکە ناهەموارەوە . وێڕای ئەوە ، بێوچان و دڵسۆزانە زوو بۆی تەواوکردم ... هەرچەندیشم کرد یەك پوولی لێ وەرنەگرتم .

چاکە و یارمەتی و هاریکاری و کۆمەك و خەمخۆری و پەرۆش و بەتەنگەوەهاتن و سۆز و کام و ئاوەز و ئارەزووی ڕاژەی زۆر و بێسنووری مایەی شانازی و ستایشە و چاکەی هەرگیز لەبیر ناکەم و هیوادارم تا دێ هەر سەرکەوتوو و بەرخوردار بێ .

بەندەش لەگەڵ ئەوەی مامۆستاشی بووە ، سەری ڕێز بۆ خۆی و هەڵوێستی بالای دادەنوێنێ .

ئەورەحمان

## کتێبە چاپکراوەکانی
## کۆڕی زانیاری کوردستان و ئەکادیمیای کوردی

**کۆڕی زانیاری کوردستان:**

١) فەرهەنگی زاراوە (عەرەبی - کوردی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٢، (١٤٢ لاپەڕە).

٢) کوردی تورکمانستان - مێژوو - ئەتنۆگرافیا - ئەدەب، د. مارف خەزنەدار، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣، (٢٥٨ لاپەڕە).

٣) زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٠ لاپەڕە).

٤) زاراوەی کارگێڕی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕە).

٥) من ينابيع الشعر الكلاسيكي الكردي، ج١، رشيد فندی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢٤٠ لاپەڕە).

٦) ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٥٦ لاپەڕە).

٧) ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاك، د.شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (١٥٩ لاپەڕە).
٨) چوارینێن خەیام، د. کامیران عالی بەدرخان، وەرگێڕانی لە لاتینییەوە د. عەبدوللا یاسین ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٩٤ لاپەڕە).
٩) شێوەی سلێمانی زمانی کوردی، د. زەریٚ یوسوپۆڤا، و: لە ڕوسییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢١٦ لاپەڕە).
١٠) العروض في الشعر الكردي، احمد هردی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢١٨ لاپەڕە).
١١) ژانرەکانی ڕۆژنامەوانی و مێژووی چاپخانە ١٤٥٠ ـ ١٥٠٠، د. مەغدید سەپان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٨ لاپەڕە).
١٢) زاراوەی ڕاگەیاندن، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٠٨ لاپەڕە).
١٣) فەرهەنگی زاراوەگەلی ڕاگەیاندن (ئینگلیزی ـ کوردی ـ عەرەبی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٦٥ لاپەڕە).
١٤) ئەدەبی منداڵانی کورد ـ لێکۆڵینەوە ـ مێژووی سەرهەڵدان، حەمە کەریم هەورامی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٤٠٦ لاپەڕە).
١٥) گیرەکێن زمانێ کوردی، د. فازل عمر، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٣٤ لاپەڕە).

١٦) ل دۆر ئەدەبێ كرمانجی ل سەد سالاْ نوزدێ و بیستێ زایینی، تەحسین ئیبراهیم دۆسكی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٦ لاپەڕە).
١٧) دەنگسازی و بڕگەسازی لە زمانی كوردیدا، د. شێركۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٠٦ لاپەڕە).
١٨) هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێكی كرمانجی سەروودا ١٩٣٩ ـ ١٩٧٠، د. عبداللـه یاسین عەلی ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٣٢٠ لاپەڕە).
١٩) یوسف و زولەیخا، حەكیم مەلا ساڵح، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٧ لاپەڕە).
٢٠) زمانی كوردان ـ چەند لێكۆڵینەوەیەكی فیلۆلۆجی زمان، پ. د فریدریش موولێر ئەوانی تر، و: لە ئەڵمانییەوە د. حمید عزیز ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٩٢ لاپەڕە ).
٢١) ڕێبەری بیبلۆگرافیە كوردییەكان ١٩٣٧ ـ ٢٠٠٥، شوان سلێمان یابە، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٠ لاپەڕە).
٢٢) فەرهەنگی گەورەی من. د. كوردستان موكریانی، چاپی یەكەم، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ، (٨٠ لاپەڕە).
٢٣) دیوانی عەزیز ـ محەمەد عەلی قەرەداغی ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠، (١٤٤ لاپەڕە).
٢٤) زاراوەگەلی كاروباری مین ـ جەمال جەلال حوسێن ـ دلێر سابیر ئیبراهیم ـ دەزگای گشتی هەرێم بۆ كاروباری مین، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٨٠ لاپەڕە).
٢٥) زاراوەی ڕاگەیاندن ـ كەمال غەمبار ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٩٦ لاپەڕە).

٢٦) زاراوەی ئەدەبی ـ ئامادەکردنی: لیژنەی ئەدەب لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٣٨٠ لاپەڕە).
٢٧) ئیندێکسی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد (١٩٧٣ ـ ٢٠٠٢) ـ شوان سلێمان یابە ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٢٤٠ لاپەڕە).
٢٨) The Historical Roots of the National Name of the Kurds ـ د. جەمال رەشید، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (١٠٧ لاپەڕە)
٢٩) فەرهەنگی کۆمەڵناسی ـ عوبێد خدر ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٣ لاپەڕە).
٣٠) بزاڤی رزگاریخوازی نیشتیمانی لە کوردستانی رۆژهەلاتدا (١٨٨٠ ـ ١٩٣٩ز) ـ د.سەعدی عوسمان هەروتی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٥٥ لاپەڕە ).
٣١) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا ، نووسینی: حەسەن عەلی خانی گەڕووسی ، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ٢٠٤ لاپەڕە ).
٣٢) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەی ئەرمەنیدا، نووسینی: ئەسکەندەر غوریانس، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٢٨ لاپەڕە ).
٣٣) فەرهەنگی کوردی ـ فارسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١١٢ لاپەڕە ).
٣٤) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەی ئینگلیزی و ئەمریکی دا ـ د. نووسینی ـ وەدیع جوەیدە. وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە ـ محەمەد حەمە باقی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١١٦ لاپەڕە ).

٣٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی خان گۆنەخان ئەفشار. وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٤٢٦ لاپەڕە ).
٣٦) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی ئەکبەر سەرهەنگ. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧. (١٩٢ لاپەڕە).
٣٧) چەپکێك لە زاراوە گەلی کشتوکاڵ ـ ئامادەکردنی ـ حەمە ساڵح فەرهادی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٤٤ لاپەڕە).
٣٨) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران دا. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٢٧٠ لاپەڕە)
٣٩) فەرهەنگی دیوانی شاعیران (نالی، سالم، کوردی)، نووسینی ـ د. محەمەد نووری عارف، چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٠٠٠ لاپەڕە).
٤٠) یەکەم فەرهەنگی تۆ، وەرگێڕانی: د.کوردستان موکریانی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٦ لاپەڕە).
٤١) ئەدەبی منداڵانی کورد دوای ڕاپەڕین، نووسینی: حەمە کەریم هەورامی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٦٨ لاپەڕە).
٤٢) فەرهەنگی هەراشان، کۆکردنەوە و داڕشتنی: کۆمەڵێك مامۆستا، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٣٦ لاپەڕە).

**ئەکادیمیای کوردی:**

٤٣) ئەلبوومی کەشکۆڵ، ب ١، دانراوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە).

٤٤) الأدب الشفاهي الكردي ، علي الجزيري ، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٢٠٠ لاپەڕە).
٤٥) بەركولّـێكی زاراوە سازیی كوردی، ئامادەكردنی: جەمال عەبدول، دووەم چاپ، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٣٣٠ لاپەڕە).
٤٦) دیوانی قاصد، ساغكردنەوەی: شوكر مستەفا و رەحیم سورخی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە ).
٤٧) چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی كورد لە سەدەكانی ناوەڕاستدا، نووسینی: دكتۆر زرار سدیق تۆفیق، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).
٤٨) كیمیای ژەهری دەستكرد. نووسینی: پ.د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).
٤٩) ڕۆڵی سەربازیی كورد لە دەولّەت و میرنشینە ناكوردیەكان لە سەردەمی عەبباسیدا، نووسینی: مەهدی عوسمان حسێن هەروتی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٣٦٨ لاپەڕە).
٥٠) دور نواب السليمانية في المجلس النيابي العراقي (١٩٤٥ ـ ١٩٥٨)، دانانی: سالار عبدالكريم فندی الدوسكی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٣٠٤ لاپەڕە).
٥١) عبدالله گۆران، رائداً لحركة تجديد الشعر الكوردي، دانانی: كەمال غەمبار چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٣٢٠ لاپەڕە).
٥٢) وثائق بريطانية عن تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤ ـ ١٩٢٧ ، دانانی: د.عبدالفتاح علی البوتانی، چاپخانەی خانی ـ دهۆك، سالّی ٢٠٠٨، (٢٦٨ لاپەڕە).
٥٣) سالّنامەی ئەكادیمیای كوردی ، ئامادەكردنی: پرۆفیسور د. وریا عومەر ئەمین ـ چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، سالّی ٢٠٠٩، (٥٦ لاپەڕە).

٥٤) مەمێ و زینێ، ئامادەکردنی: جاسمێ جەلیل، دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ خستوویەتییە سەر نووسینی کوردیی عیراق و پێشەکیی بۆ نووسیوە و لێی کۆڵیوەتەوە، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٨ لاپەڕە).
٥٥) هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی لێکۆڵینەوەی (دیوانی سالم)دا، محەمەدعەلی قەرەداغی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٠ لاپەڕە).
٥٦) کەرەسە بەتاڵەکان لە روانگەی تیۆری دەسەلات و بەستنەوە ((شێوەزاری کرمانجی سەروو))، نووسینی: ڤیان سلێمان حاجی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢١١ لاپەڕە).
٥٧) هێز و ئاواز لە دیالێکتی کوردیی ژووروودا، نوسینی: عەبدولوەهاب خالید موسا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، سالی ٢٠٠٩، (١٤٦ لاپەڕە).
٥٨) گەپنامەی مێرگولان، نوسینی: ڕەسوڵ دەروێش، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، ( ١٧٦لاپەڕە).
٥٩) دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆرو هەندی لایەنی ڕستەسازیی کوردی، ئامادەکردنی: یوسف شەریف سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٣٤ لاپەڕە).
٦٠) هەندێ لایەنی ڕێزمانی دەسەلات و بەستنەوە (GB) لەزمانی کوردیدا، ئامادەکردنی: د.سەباح ڕەشید قادر، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٧٢ لاپەڕە).
٦١) الحياة الاجتماعية للكورد بين القرنين (٤ ـ ٩هـ/١٠ ـ ١٥م)، دانانی: دکتۆرە فائزە محەمەد عزەت، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٧٢ لاپەڕە).
٦٢) العلاقات الايرانية ـ السوفيتية ١٩٣٩ ـ ١٩٤٧، دانانی: نزار ايوب حسن الكولی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٩٠ لاپەڕە).

٦٣) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە فەرەنسییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٥٢٨).
٦٤) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٤٤٨).
٦٥) امیر امراء کردستان (ابراهیم باشا الملی ١٨٤٥ ـ ١٩٠٨)، دانانی: أ. د. عبدالفتاح علی البوتانی ـ علی صالح المیرانی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٦) دیوانا مەلا محەمەدێ سەیدا، بەهەڤکار: سەید جەلال نزامی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٨ لاپەڕە).
٦٧) داستانی هەیاسی خاس و سوڵتان مەحموود، نووسینی: محەمەد سالح سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٣٢٦ لاپەڕە).
٦٨) کیمیای ژینگە، پیسبوونی ئاووهەوا، پ . د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٩) گەشتنامەی پوژۆلا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٩٨ لاپەڕە).
٧٠) ڕێزمانی کوردی، وەرگێڕانی: د. نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٤٤ لاپەرە).
٧١) بونیاتی زمان لەشیعری هاوچەرخی کوردیدا، نووسینی: د. ئازاد ئەحمەد مەحموود، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (٢٥٨ لاپەڕە).
٧٢) الحرکة الشیوعیة في تقاریر مدیریة الامن العامة ١٩٥٩ ـ١٩٦٢، نووسینی: د. عبدالفتاح علی البوتانی، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٨٨ لاپەڕە).

٧٣) فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی (جزیری و مەحوی)، نووسینی: د. ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٣٦٠ لاپەڕەیە).
٧٤) چیرۆکی منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا (١٩٩١ ـ ٢٠٠٥)، دانانی: ڕازاو ڕەشید صەبری، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢١٢ لاپەڕە).
٧٥) هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیاندا، نووسینی: پ. د. موحسین موحەممەد حوسێن، عثمان علی قادر کردویە بە کوردی، چاپخانەی حاجی هاشم — هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٤٧٣ لاپەڕە).
٧٦) هەورامان باشتر بناسین، نووسینی: محەمەد ڕەشیدی ئەمینی، چاپخانەی حاجی هاشم — هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٩٦ لاپەڕە).
٧٧) فەرهەنگا کانی، نووسینی: محەمەد سالح پێندرۆیی (جگەر سۆز)، چاپخانەی سپیرێز — دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٦٣٩ لاپەڕە).
٧٨) وشەنامە، نووسینی: جەمال حبیب الله (بێدار)، چاپخانەی سپیرێز— دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (١١٤٧) لاپەڕە).
٧٩) بیبلیۆگرافیای ئەکادیمیای کوردی، ئامادەکردنی لیژنەی بیبلیۆگرافیای ئەکادیمیای کوردی، چاپخانەی سپیرێز — دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٤٠٠) لاپەڕە.
٨٠) ئاسوورییەکانی باشووری کوردستان، نووسینی د. عەبدوڵڵا غەفور، چاپخانەی سپیرێز — دهۆك، ساڵی ٢٠١٠ (٢٠٨) لاپەڕە.
٨١) جوگرافیای ئابووری نەفت لە کوردستاندا، چاپی سێیەم، نووسینی د. عەبدوڵڵا غەفور، چاپخانەی حاجی هاشم— هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٣٠٥) لاپەڕە.
٨٢) فلسفة العشق الإلهي في شعر الجزيري، تألیف محمد امین دوسكي، الطبعة الثانية، مطبعة سپیرێز— دهۆك، سنة ٢٠١٠ (١٩٦) صفحة.

٨٣) فەرهەنگی کوردی – فەرەنسی، نووسەر: ئۆگست ژابا، بلاّوکەرەوەی زانستی: فێردیناند یۆستی، وەرگێڕانی پێشەکی و دووبارە لەچاپدانەوەی: د.نەجاتی عەبدوللاّ، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٥٠٥) لاپەڕە.

٨٤) فەرهەنگی ئابووری، دانانی: پ.ی.د. سەلاحەددین کاکۆ خۆشناو، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠ (٢٥٦لاپەڕە).

٨٥) الوسائل التعليمية ومعوقاتها في تدريس العلوم، رشيد فندي، مطبعة سپيرێز – دهوك، سنة ٢٠١٠ (١٣٠) صفحة.

٨٦) سایکۆلۆژی زمان

٨٧) الكُرد في مؤلفات المقريزي التاريخية – دراسة تحليلية، الدكتور فرهاد حاجي عبوش، مطبعة سبيريز– دهوك، سنة ٢٠١٠ (٤١٨) صفحة.

٨٨) من معالم الحياة الكردية في سوريا / تأليف ميديا عبدالمجيد محمود، مطبعة سپيرێز – دهوك ٢٠١٠، ٢١٦ صفحة.

٨٩) ئێل و ئویجاخێن کوردا ل کوردستانا ئیرانێ، وەرگێرانا مەسعود گولی، چاپخانا سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١٤٠ لاپەڕە.

٩٠) سمکویێ شکاك و شۆڕەشا وی د بەلگەنامەیێن ئیرانیدا، ئامادەکرن و تویژاندن فاخر حەسەن گولی و وەرگێران و پێداچوون نزار ئەیوب گولی، چاپخانا سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٨٤ لاپەرە.

٩١) الفارقي ومنهجة من خلال كتابة تاريخ ميافارقين وآمد، تأليف سطظان محمد سعيد كوچر، مطبعة سپيرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٠٨ صفحة.

٩٢) پەندی کوردی، نووسینی حەمید رەشاش، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠ ، ٣٢٤ لاپەڕە.

٩٣) دو فەرهەنگێن ڤەهاندی نووبار و (مرصاد الأطفال) بەرهەڤکرنا تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١١٢ لاپەرە.

٩٤) دو ڤـەهینۆکێن کرمـانجی د علمـیَ تەجویـدیَ دا، بەرهـەڤکرنا تەحـسین ئیـبراهیم دۆسکی، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ١٠٠ لاپەرە.

٩٥) لێکولێنـەوەو سـاغکردنەوەی بەشـێك لـە دیـوانی مـوخلیس. د. ئیـبراهیم ئەحمـەد شوان، چاپخانەی سپیرێز – دهۆك ٢٠١٠، ٣٢٤ لاپەرە.

٩٦) دیوانا نەفعی، ساخکرن و بەرهـەڤکرن تەحسین ئیبراهیم دۆسـکی و مەسـعود خالـد گولی، چاپخانا سپیرێز/ دهۆك ٢٠١٠، ٢٦٠ لاپەرە.

٩٧) بنیاتی جۆرەکانی ڕووداو لە ڕۆمانی کـوردی باشـووری کوردسـتان، نووسـینی ڕێـزان عوسمان (خاڵە وێوە)، چاپخانەی سپیرێز/ دهۆك ٢٠١٠، ٢٧٦ لاپەرە.

٩٨) تورك لە بولگارستان، کورد لە تورکیا، نووسینی، عەزیز نەسین، وەرگێران و ئامـادە کردنی، بەکر شوانی و سیروان ڕەحیم، چاپخانەی حـاجی هاشـم/ هـەولێر ٢٠١٠، ١٤٠ لاپەرە.

٩٩) الدولة الأيوبية وفق نظرية الدولة لابن خلدون، تأليف: د. حكيم عبـدالرحمن البـابيرى، مطبعة، حاجى هاشم/ أربيل ٢٠١٠ ، ٣٢٠ صفحة.

١٠٠) فەرهەنگی پزیشکی ، دانانی د. جـەمال ڕەشـید، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر ٢٠١٠، بەرگی یەکەم ٨٤٠ لاپەرە.

١٠١) فەرهەنگی پزیشکی ، دانانی د. جەمال ڕەشـید، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر ٢٠١٠، بەرگی دووەم ٧٩٦ لاپەرە.

١٠٢) فەرهەنگی پزیشکی ، دانانی د. جەمال ڕەشـید، چـاپخانەی حـاجی هاشـم، هـەولێر ٢٠١٠، بەرگی سێیەم ٦٨٠ لاپەرە.

١٠٣) ڕاسپاردەکانی کۆنفرانـسی بـەرەو ڕێنووسـێکی یـەکگرتووی کـوردی، ئامـادەکردنی: لیژنەی زاراوە لەئەکادیمیای کوردی، هەولێر ساڵی ٢٠١٠، چاپخانەی حـاجی هاشـم – هەولێر، (٦٤) لاپەڕە.

١٠٤) رۆژنامەنووسی پرۆفیشناڵ و ئیتیکی رۆژنامەوانی، نووسینی: محەمەد ساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ٢٠١٠، (١٨٨) لاپەڕە.
١٠٥) ڕەوتی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە باشووری کوردستان لەساڵانی (١٩٨٠–١٩٩١) دا، نووسینی : د. حوسێن غازی کاک ئەمین گەلاڵەیی، چاپخانەی حاجی هاشم– هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢٣٥) لاپەڕە.
١٠٦) فەرهەنگی میدیا (کوردی–کوردی)، بەرگی یەکەم، نووسینی: د.ئەورەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی حاجی هاشم – هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢٨٩) لاپەڕە.